# کوردستان گەورەترین
# هێرش بەچەکی کوشندەی کیمیاوی

## لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە دژی کوردەکانی عێراق

رێکخراوی V. i. S. d. P ئەڵمانی

# کوردستان گەورەترین هێرش بەچەکی کوشندەی کیمیاوی

## لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە دژی کوردەکانی عێراق

وەرگێڕانی لە ئەڵمانیەوە

ناسح ئیبراهیم دزەیی

پێداچوونەوە و سەرپەرشتی

دلێر ئەحمەد ئاکۆ

- شادعەیانەکان: سەربازەکان، سیاسییەکان، پزیشکەکان لەناوچە ئازاد کراوەکان.
- زۆر لایەن بازرگانی شەڕەکانی ناوچەی کەنداو بوون.
- چیرۆکێکی کورت لەسەر شەڕ بەچەکی کیمیاوی.

## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی


- **کوردستان گەورەترین هێرش بەچەکی کوشندەی کیمیایی**
- **نووسینی:** رێکخراوی V. i. S. d. P ئەڵمانی
- **وەرگێران بۆ کوردی:** ناسح ئیبراهیم دزەیی
- **پێداچوونەوە و سەرپەرشتی:** دلێر ئەحمەد ئاکۆ
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **پیتچنین:** رێدار جەعفەر – سۆزان عزەددین
- **بەرگ:** ئاسۆ مامزادە
- **ژمارەی سپاردن:** ١٨٣٣
- **نرخ:** ١٥٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠٠٨**
- **تیراژ:** ١٥٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆک)

**زنجیرەی کتێب (٣٢٠)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

ناونیشانی ڕێکخراوی V. i. S. d. P ئەڵمانی

W. Prinz
Vinckestr 11
58 Hagen
Deatschland

## پێشەکی:

ئاشکرایە کە لە ناوەڕاستی مانگی ئاداری ١٩٨٨ هێرشێکی گەورە بەچەکی کیمیاوی لەلایەن سوپای عیراقەوە بەفڕۆکە کرایە سەر هاولاتیانی کوردی عیراق. ئەمجارە نەك تەنها هێرشێکی گازی کوشندە و ژەهراوی مەترسیدار و سامناك دژی گەلی کورد ئەنجامدرا بەڵکو گەورەترین هێرش بووکە بەگازی ژەهراوی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە ئەنجام درابێ.

ولاتی ئەڵمانیا تووشی هەڵوێستێکی زۆر ناخۆش بوو چونکە چەند کۆمپانیایەکی ئەو ولاتە دەستی بەشداریان هەبوو لە دروستکردنی ئەم چەکە ژەهراوی و قەدەغەیە و پێدانی کەرەسەی خاو (موادالخام) وەك: Phosgen. Tabum. Yperit. Blausaure بۆ رژێمی عیراق.

کۆمپانیا ئەڵمانییەکان رێگای بەکارهێنانی گازی خنکێنەریشیان بۆ رژێمی عیراق نارد، لەوانەیە لەو بابەتە خراپتریشیان بۆ رژێمی ئێران ناردبێ. ئەمەش بەخۆ بێدەنگ کردنی حکوومەتی ئەڵمانیا بەرامبەر ئەم تاوانە. کێ بوون ئەوانەی لە ئێمە کە هەستا بە پێدانی ئەو شتانە وەك رێنمایی لە نامیلکەیەك بە درێژی؟

لە راستیدا هەر لە ساڵی ١٩٨٤وە بە بەردەوامی لە رۆژنامەکان و ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەڵمانیا ئەو گفتوگۆ لەسەر ئەو مەسەلەیە دەکرا، بەڵام نەك وەك کێشەیەکی کاریگەر و زەق لە ئەڵمانیای فیدراڵی هەستی وای پێ بکرێ کە رێگا بگیرێ لەم جۆرە یارمەتییە نارەوایە و راگرتنی.

هانس براند شاید_ قسەکەرێکی رێکخراوی جیهانی – Inter national Medico لە بانگەوازێکدا داوای لەگەلی ئەڵمانیای دیموکرات کرد لە ٩/٤/ ١٩٨٨لە شاری بۆن – پایتەختی ئەو سای ئەڵمانی رۆژئاوا خۆ پیشاندانێکی نارەزایی دەربرین ساز بکەن.

دەمەوێ ئەمرۆ لەم کۆبوونەوەیەماندا بیچەسپێنن کە راستی و باوەڕی دیموکراتیمان داوامان لێ دەکات لێکۆڵینەوەیەکی مرۆڤایەتی و زانستییانە بکەین بۆ ئاشکراکردنی راستییەکان لەم بارەیەوە.

پێویستە ئێمە هاوکارێکی بەهێزبین بۆ پشتیوانی لەگەلی کورد و دژی ئەو کەسانە راوەستین کە زۆر نارەوایانە و تاوانکارانە لەولاتەکەمان یارمەتی هێرشێك دەدەن بەچەکی ژەهراوی دژی نەتەوەکانی تر.

تیلمان چولیش — یەکێکە لە سەرکردە کۆمەلایەتییەکانی ئەلمانی یەکگرتوو و چاودێری ئەو نەتەوانە دەکا کە ژیانیان لە مەترسیدایە لە جیهانی سێیەم لە بەشداریکردنەکەیدا وتی: ئەم جۆرە خۆپیشاندان و چالاکییانەی گەلی ئەلمانیاو جیهانی کراوە دژی ئەم تاوانانە، بەلایەنی کەم تیشکێکی هیوابەخشە بۆ ئەو نەتەوە چەوساوە و هەرەشەلێکراوانە. حکوومەتی ئەلمانیا و وەزیری دەرەوە، بەزۆر پەیوەندی هەندێ لەو کۆمپانیایانەی پچری لەگەل رژێمی عیراق و ئێران لەبەر کاری نا پەسندانە و نابەجێیان. ئێمەش پێویستە بەردەوام بین لەسەر نارەزایی دەربریمان و حکوومەتمان ناچار بکەین ناردنی چەك و پێداویستی جەنگ قەدەغە بکا بۆ شەری کەنداو. و دەبێ لێژنەیەك لە پەرلەمانی ئەلمانی پێك بهێنرێت بۆ ساغکردنەوەی ئەو کارگانەی گازی ژەهراوییان بەرژێمی عیراق داوە و بەرپرسان لەم تاوانە دادگایی بکرێن و سزای شیاویان بدرێن و قوربانیانیش قەرەبوو بکرێنەوە.

بەلام هەرئەوەندە بەس نییە، چونکە بالیۆزی عیراق زۆر بێ شەرمانە نکوولیی لە تاوانی حکوومەتەکەی دەکات، پێویستە ئەو بالیۆزە لەولاتەکەمان دەربکرێ. سەرەرای ئەو هەموو رووداوانە حکوومەتەکەمان هەر بێدەنگە.

هەتا پارتی سەوز لە پەرلەمانی ئەلمانی چالاك بوو و بەخێرایی لیژنەیەکی بۆ لێکۆلینەوە پێکهێنا، حکوومەتی ئەلمانیاو خاچی سووری ئەلمانی زۆر سست بوون و ئامادە نەبوون هاوکاری بکەن لەگەل خاچی سووری سویدی و هەنگاری بۆ یارمەتی مرۆڤایەتی.

بەلام پێویستە لەکارەکانتان بەردەوام بن و فشار بخەنە سەر پەرلەمانی ئەلمانی بۆ ئەوەی لیژنەیەکی کۆمەلایەتی ئامادە بکات و نامە بنووسن و بەردەوام بن لە پرسیارکردن و لێکۆلینەوە چونکە بەپرسیارەکانتان هەست بە جوولانەوە دەکەن.

دادگاش لەگەل رێکخراوی جیهانی MedicoInt national کەناوی میدیکۆیە بەیەکەوە کاردەکەن بۆ دروستکردنی پرۆگرامێکی یارمەتی دژی ئەو هێرشەی گازی ژەهراوی.

# هێرشی گازی ژەهراوی پاش نیوەڕۆ

**قسەی ئەو شاهید عەیانانەی کە لەئێرانەوە هاتبوون شارێکی کوردی (هەڵەبجە)یان داگیرکردبوو:**

لەناو شەقام و کۆڵانەکانی هەڵەبجە بە سەدان تەرمی ژن و منداڵ و پیاوی پیر کەوتبوو، بێ ئەوەی شوێنەواری هیچ برینێك لەسەر جەستەیان دیاربێ، هەندێکیان وەك خەویان لێ کەوتبێ، هەندێکیشیان دەورەیان لە یەکتر دابوو وەك هەوڵێك خۆ لە مردن رزگار کردن، و لە تەنیشتیانەوەش لاشەی ئاژەڵی مردوو بوو. بەپێی قسەی ئێرانییەکان ئەوە گەورەترین هێرش بوو بەگازی ژەهراوی دوای تێپەڕ بوونی حەوت ساڵ بەسەر ئەم جەنگە.

ئێران بەرەسمی عیراقی تاوانبار دەکرد بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی وداوای لە میدیاکانی رۆژئاوا دەکرد بۆ سەردانی هەڵەبجە و قوربانیانی گازی ژەهراوی.

بەقسەی سەربازانی ئێرانی ئەو هێرشەی سوپای عیراق بە چەکی کیمیاوی وەڵامی ئەو هێرشە سەرکەوتووەی پاسدارانی ئێران و پێشمەرگەی کوردە، کە نزیکەی ٣٠کم چووبوونە ناو خاکی عیراقەوە.

بە قسەی کەسانێك کە رزگاریان ببوو، بەچاوی خۆیان دیویانە کە لە کاتژمێر ٢ی پاش نیوەڕۆی رۆژی چوارشەممە فرۆکەیەکی جەنگی هات چەندەها بۆمبی کیمیاوی فڕێدایە سەریان. وەك هەورێکی سپی زەرداوی یەکسەر هاتە خوارەوە بەسەر شاری هەڵەبجە بڵاو بووەوە و دەرفەت نەما بۆ دانیشتوانی ناوشار هەڵبێن و بەسەدەها بەڵکو بەهەزاران کەس لە دانیشتوان بەم چەکە کوشندەیە گیانیان لە دەست دا (کە گازەکەش پێکهاتبوو لە تێکەڵەی زینفوند و بلاوزۆیدە).

هەندێك لەوانەی توانییان خۆیان رزگار بکەن و پسپۆڕانی ئێرانیش باسدەکەن ژێر زەمین و دیواری ئەستوور هیچ سنوورێکی نەبوو بۆ خۆپاراستن بەڵکو ئەم گازە ژەهراوییە لەهەموو کون و کەلەبەرێك بڵاو دەبۆوە و بەزووترین کات دەبووە هۆی لە دەستدانی گیانی ئەوکەسانەی کە لەناو ناوچەی شاڵاوەکە بوون.

وێنەی ژمارە (١)

دانیشتووانی شاری هەڵەبجە باوەڕی تەواویان هەیە کە ئەو هێرشە ژەهراوییە لەلایەن فڕۆکەکانی عیراقەوە بوو کە ئەو مەرگەساتە کوتوپڕەی بەسەرهێنان.

وئەم هێرشە دوای شکستی سوپای عیراقی لەسەر زەوی و کشانەوەیان لەناوچەکەو دیلبوونی ژمارەیەکی زۆر لەسەربازانی عیراقی ئەنجامدرا.

لەتاران دوایی پشکنینی پزیشکیی ئەو قوربانییانەی بەبرینداریی مابوونەوە، روون بۆوە، کە لەم هێرشە (زێنقود —Sentund و بلاو زۆیرگاز Blau saurgas) بەکار هاتووە و کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر کرۆکی ئێسك (نخاع العظام). جگە لەوەش مادەیەکی ژەهراوی تیابوو کە پاش ماوەیەکی تر کاردەکاتە سەر برینی پێست و مێشك و سییەکان بریندار دەکات. ئەو پاسدارانەی دوای سەرکەوتن چووبوونە ناوشاری هەڵبچە تووشی ئەو مادە ژەهراوییە ببوون. بەرپرسانی ئێرانی باوەڕیان وایە کەرێژیی عیراق وەك سزایەکی سەخت ئەم هێرشە کاریگەرەیان کردە سەرکوردەکان لەم ناوچەیە.

لەمانگی مایسی ١٩٨٧ کوردەکان راپەرینێکیان دژی رژێمی عیراق هەڵگیرساند دواییش لەبەر مەترسی کاردانەوەی رژێم بەشێکی زۆریان شارەکەیان بەجێهێشت.

شاری هەڵبجە (کە جامیەی لێ بوو) لە باکووری رۆژئاوای ئەم شارە کەتە ژێر دەستی دوژمن (سوپای پاسداران و پێشمەرگەی کورد.)

Patrick E. Tyler, Fr 25. 3. 88

پێستی مردووەکان رەنگێکی سەیری بەسرە بەسەرهاتبوو، چاویان لە قوولاییەوە کرابۆوە و کەفیان لەسەر دەم وەستابوو پەنجەکانیان رەق ببوونەوە. مردن لەناکاو باڵی خۆی بەسەر نزیکەی (٧٠,٠٠٠) حەفتا هەزار کەس لە دانیشتووی شاری هەڵەبجە دا پۆشی کە ژیانی ئاسایی رۆژانەیان بەکارو کاسبی دەبردەسەر، کەچی هەر فریای ئەوە کەوتن بەرەو ماڵ راکەنەوە و لە دواییش وەك گەڵای دار هەڵدەوەرینە سەر زەوی. دایکان لەدوا چرکەی ژیانیادا دەستیان دەکردە ملی منداڵەکانیان و باوکێکی بە ساڵداچوور هەوڵیدا کۆرپە ساواکەی بەلەشی خۆی بپارێزێ ئێرانییەکان وتیان فرۆکەکانی عیراقی (Zyanid- زیانید) یان فرێداوەتە خوارەوە.

هەروەها د. سەعید فروتان وتی: هەر بۆمبێك ١٠٠ لیتری تێدایە ولە رۆژێکی ساردادا ئەوگازە هەتا بەیانی بەخێرایی ٥٠٠م بلاودەبێتەوە و کەس ناتوانێ رزگاری بێ ئەو جۆرە بۆمبانە کە بەکاربێت هیچ شێوەیەکی تەقینەوەی پێوە دیار نابێ تەنها لەسەر مرۆڤ نەبێ.

وێنەی ژمارە (٢)

دکتۆر فروتان وتی: لەهەندێ گەڕەکی ئەم شارد گازی (خەردەل) فڕێدراوە کە شا دەمارەکانی مرۆڤ تێکدەدات.

ناو شارو گەڕەك و شەقەماکان هیچ کەسێکی خەڵکی هەڵەبجە نەدەبینرا تەنها سەربازانی ئێرانی و پیاوانێك کە هەموویان یەك جۆرە بەرگیان لەبەردا بوو (مەبەستی لە پێشمەرگەیە) و لەناو شارەکە دەسوڕانەوە.

ئەو شارە بازاڕێکی گەورەی هەبوو کە لە سەدەها دوکان پێکهاتبوو، بەڵام جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئەو ماڵانەی سەردانمان کردن و بەکاولیی جێییان هێشتبوو. تەنها چەند پیاوێکی بەتەمەن بەجلوبەرگی کوردی دەبینران کە دیاربوو خەڵکی هەڵبجە بوون. مەڕ و ماڵاتێکی زۆریش لە قەراغ شەقامەکان لەناو سەوزەگیای بەهار لاڵ و پاڵ کەوتبوون.

بەڵێ شاری هەڵەبجە لەسەردەمی ئاشتیدا دانیشتوانی نزیکەی ٦٠ تا ٧٠ هەزار کەس دەبوو، بەڵام لەم ساڵانەی دوایی نیوەی دانیشتوانەکە کۆچیان کرد و ئەو شارەیان بەجێهشت، بەهۆی هێرشە دڕندانەکانی رژێمی عیراقی بۆ سەر ئەو شارە و شەڕی ناوخۆیی نێوان پارتە کوردەکانیش. زۆربەی گەنجانی شارەکە لە ساڵانی شەڕی عیراق — ئێران — بەرەو شاخ رۆیشتن. بەشێك لە دانیشتوانی ئەو شارە بەخۆیان و خێزانیانەوە شارەکەیان جێهێشتبوو، بەشێکیش دوای ١٥ -/ ٣/ ١٩٨٨ هەڵاتن لەبەر تۆپبارنی سوپای عیراقی. دوای ئەوەی ئێرانییەکان شارەکەیان گرتبوو هێرشی بەردەوامی فڕۆکەکانی سوپای عیراقی دەستی پێکرد بۆ سەر شارەکە لە ٣/١٦ تا ٣/١٨ بەردەوام بوون. ئەو خەڵکەی رزگار ببوو دەیانگوت رۆژی هەینی ٣/١٨ ئەو هێرشە ئاسمانییە گەیشتە بەرزترین رادەی سەختی کە خاکەکە لەژێر پێیان دەلەرزییەوە و لەبەر گرمە و تەقینەوەی بۆمباکان و بڕوایان وایە بۆمبای (فسفۆریش) یان بەکارهێنا چونکە چاوچاوی نەدەدیت.

## راپەڕینی کورد

خەڵکی هەڵەبجە لایان سووربوو کەرژێمی عیراقی نیازی زەبر وەشاندنە وەك سزایەك لەبەر ئەوەی بەیارمەتی و پشتگیری ئێران دژی رژێم راپەریبوون ئەگەرچی سەربازەکانی عیراقی نەیاندەویست لە هەڵبجە بجەنگن، شەڕێکی گەورە لەنێوان پاسدارانی ئێرانی و سوپای عیراق لە خورماڵ روویدا و ئێرانییەکان توانییان رێگای سەرەکی بۆ شاری سلێمانی ببڕن.

دانیشتووانی هەڵبجەش بەپشتیوانی پێشمەرگە توانیان سەربازانی عیراقی بەدیل بگرن پێش ئەوەی سوپای ئێرانی بێتە ژووری.

Arnold Hottinger inder Nzz 25. 3 . 88

## ئاورێك لە رابردوو

وێنەی ژمارە (٣)

ئەو جەنگەی نێوان عیراق و ئێران هیچ ئەنجامێکی نییە لەبەر ئەوەی هیچ لایەکیان سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ. تەنها لەناوچە شاخاوییەکانی باکووری عیراق کە لەژێر کۆنترۆڵی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان P. U. K و پارتی دیموکراتی

کوردستان K. D. P و چەند پارتێکی بچووکی کوردستانی بوو و ورەیان بەرز بوو و پارتی دیموکراتی کوردستان هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕ لەگەڵ ئێران رێك کەوتبوون دژی رژێمی عیراقی.

بەڵام یەکێتی نیشتمانی کوردسان کە ناوچەکانی هەڵبجە و سلێمانی لەژێر کۆنترۆڵدا بوو تا ماوەیەك خەریکی دانوستان بوو لەگەڵ رژێمی عیراق.

بەڵام ناوەناوەش شەڕ و پێکدادان لەنێوان هێزەکانی یەکێتی و سوپای رژێمی عیراق ڕووی دەدا چونکە رژێمی عیراق لە عەرەبی کردن بەردەوام بوو.

لەهاوینی ۱۹۸۳ رێکەوتنێکی ئاگربەست لەنێوان سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی و سەدام حسێن بەسترا – عیراق لەگەڵ تورکیاش رێککەوتن کە هەروڵاتێك رێگای هەیە بە قوڵایی ۳۰کم بچێتە ناو خاکی ئەوی تر لەکاتی لێدانی هێزی کوردەکانی وڵاتی خۆیان.

لەمانگی ئەیلوول ئەو رێکەوتنە هەڵوەشێنرایەوە چونکە رژێمی عیراق باوەڕی وابوو دەتوانرێ بەرەیەك لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی ببەستێ و لەهەمان کاتیش گەورەترین هێرشی ئێران لە خوارووی عیراقی لەکەرتی بەسرە شکستی هێناو شکا.

وێنەی ژمارە (٤)

سەدام هەڕەشەی دەکرد کە ئەگەر پێویست بێ کوردستان لە دانیشتوان چۆڵ دەکا.
ئیتر لێرەوە دەستیپێکرد و بەرێگایەکی پلانبۆدارێژراو سوپا ی عیراقی دەستیکرد بەهێرش بۆ سەر گەلی کورد بە دڕندانەترین شێوەکەوتە گرتن و کوشتن و ڕاگوازتن و ڕاوەدوونانی کوردەکان، کە بووە هۆی ڕوودانی شەڕێکی گەورە لەنێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عیراق. سوپای عیراق هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو بنکەکانی پێشمەرگە بەتایبەتی بارەگاکانیان لە دۆڵ و ئەشکەوتەکان وێرانبکاو بەردەوام تۆپبارنی دەکردن. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی هەموو پارتە کوردستانییەکان یەك بگرن و دژی رژێمی عیراق خەبات بکەن. پێش ساڵێك هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی و پارتی و حزبی شیوعی لەگەڵ هەردوو پارتە گچکەکەی سۆسیالیستی کوردستان توانییان ناوچەی قەرەداغ بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان کە دوای ٤٨ سەعات بەچەکی کیمیاوی ناوچەکە تۆپباران کرا.

بەهۆی بەردەوامی هێرشە دڕندانەکانی رژێمی عیراقی بۆ سەر ناوچەکە، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هەوڵی هاوپەیمانێتی دەدا لەگەڵ ئێران و لەساڵی ١٩٨٥ دوای رێککەوتن لەگەڵ ئێران بەچەند مانگێك هێزەکانی خومەینی رێگەیان پێدرا بێنە ئەو ناوچانە کە لە ژێر کۆنترۆڵی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا بوو.

وێنەی ژمارە (٥)

رژێمی عێراقیش هەستی بەمەترسییەکی گەورەکرد لەم هاوپەیمانێتییە و کیمیاباران کردنی هەڵەبجەش کاردانەوەی ئەو مەترسییە بوو. بەڵام بەپێچەوانەوە سەربازانی ئێرانی لە باکوور هەر سەرکەوتننیان بەدەست دەهێنا بەیارمەتی پێشمەرگەی کورد.

بۆچوونی رژێمی عیراقی لە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی رێگایەك بوو بۆ تێکدانی هاوپەیمانیی نێوان کورد و ئێران و ئاراستەکردنی سزایەکی توندیش بۆ گەلی کورد.

ئەو تەکتیکەش لەلایەن رژێمی عیراقی بەردەوام بوو تا لە ٢/ ٤/ ١٩٨٨ دووبارە گازی ژەهراوی بەکار هێنا.

و لە ٢١/ تاکو ٢٦/ ٣/ گوندە کوردەکانی ناوچەی قەرەداغ بەچەکی کیمیاوی هێرشیان کرایە سەر کە بووە هۆی مردنی ٧٥ کەس و سەدەها بریندار ئەو بۆردوومانکردنەش بەچەکی کیمیاوی بەردەوام بوو تا باکووری رۆژئاوای ئێرانی گرتەوە کە شاری مەریوان بوو.

لە ٢٦/٤/ ١٩٨٨ لە بەیاننامەیەك کە لەلایەن رێکخراوە مرۆڤایەتییەکان (ئەوانەی کە داکۆکی لەگەلە هەرەشە لێکراوەکانی جیهان دەکەن) راگەیاندرا کە رژێمی عیراق خۆی ئامادە بۆ هێرشێك بە چەکی کیمیاوەی بۆ شاری سلێمانی. ئەو بانگەوازەش لەو کوردانەوە بلاو ببۆوەوە کە رۆژێك پێشتر وەك پەناهەندە گەشتبوونە ئەوروپا و وەك لە پارێزگای سلێمانی گوێبیستی ببوون.

بارزانی حەفتەیەك پێشتر لە بانگەوازێکدا داوای لەخەڵکی سلێمانی کرد کە بەرگری تەواو بکەن لە دژی ئەو هێرشە. سوپای ئێران و کوردە پارتیزانەکان خۆیان بۆ تەیار کردووە، ئەگەر بەرگری نەکەن لە پێش گرتنی ئەم شارە دەبێ دانیشتوانی شاری سلێمانی پێشبینی ئەوە بکەن کە رژێمی عیراقی شارەکەیان بەچەکی کیمیاوی تۆپباران دەکا. شاری سلێمانی شارێکی گەورەیە لەم ناوچەیە و ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی یەك ملیۆن کەسە

وینەی ژمارە(١٠)

بۆمبای گازی خەردەلیان دەباراندە سەر گوندەکان، رێکخراوی مرۆڤایەتی جیهانی، بۆ داکۆکی لە چەوساوەکان بەرزکردەوە کە سوپای عیراق چەکی کیمیاوی دژی دانیشتوانە کوردەکان بەکار ئەهێنێ

لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی سەر بەرێکخراوی نەتەوە یەگرتووەکان (un) لەعیراق و ئێران دوای پشکنین بۆیان دەرکەوت کە رژێمی عیراق یەکەم جار لەنیسانی ساڵی ١٩٨٧ بەرێگەی فرۆکە چەکی کیمیاوی بەکارهێناوە دژی کوردەکان و پاشان (un) راپۆرتێکی بڵاوکردەوە بێ ئەوەی ناوی هیچ وڵاتێك بهێنێ. دکتۆر ئولیرچ ئیمۆ بێرستك کە بەرێوەبەری بەشی چەکی کیمیاوی بوو لەوەزارەتی بەرگری سوسیری، لە ١٩/٦/ ١٩٨٤ لە رۆژنامەی زۆریش نوێ، راپۆرتێکی لەم بارەیەوە تووشی.

لەکۆتای ساڵی ١٩٨٣ و سەرەتای ١٩٨٤ کۆماری ئیسلامی ئێران عیراق تاوانبار کرد کە چەکی کیمیاوی دژی سوپای پاسداران بەکارهێنا و لەسەر ئەم کێشەیە ئێران سکاڵانامەی تۆمارکرد دژی عیراق لە (un) و ئەنجوومەنی ئاسایش.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٤ سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاردا دەستەیەك شارەزا (زانایانی چەکی کیمیاوی) بۆیەکەم جار پێکبهێنێت بۆ تێڕوانین لەو سکاڵایەی ئێران و ئەم دەستەیە بنێرنە ناوچەکانی شەڕ وئەم شارەزایانە یەکەیەکە بەرپرسن لەبەرامبەر سکرتێری گشتی بۆ راستی ئەم کارە.

ئەم زانایانە کە بۆ پشکنین لە چەکی قەدەغەکراو هەڵبژێران یەکێکی ئوسترالی و یەکی سویدی و ئیسپانی و یەکێکیش سویسری بوو.

لەمانگی ئادار (نەورۆز) ئەم دەستەیە یەکەم جار بەرەو کەنداوی فارس بەڕێ کەوت، بەسەرپەرشتی راوێژکاری سکرتێری گشتی ئەرکەکانیان بەم جۆرە بوو: دەبێ بە بەڵگە بچەسپێنرێ کە چەکی کیمیاوی یا چەکی لەم بابەتە بەکارهاتووە و چۆنیەتی بەکارهێنانیش چۆن بووە لە بارەی ئامێر و کەرەستە ژهراوییەکان. دەبێ روونکردنەوەش بەم جۆرەی خوارەوەبێ:

١- بەرێگای ئەو پشکنەرانەی کە ئاگادارن چەکی کیمیاوی لەناوچەکە بەکار هاتووە لەگەڵ شیکرنەوەی پارچەی تەقەمەنییەکان کە لە گۆڕەپانی شەڕدایە.

٢- دەبێ ئەو تەقەمەنییانەی چەکی کیمیاوی بەرێگای کەسی سێیەمەوە لای شارەزاکان دەستنیشان بکرێن وەك شاهیدعەیانەکان کە بەچاوی خۆیان دیویانە، جێگا، کات، بارودۆخی بەکارهێنانی.

٣- دەبێ بەرێگای پشکنینی پزیشکی و شیکردنەوەی لاشەی قوربانییانی ئەو چەکە ژەهراوییە ساخ بکرێتەوە.

هەروەها هەمان جۆری پشکنین لە شارەزایان داواکرا لە ساڵانی ١٩٨٦ — ١٩٨٧ و سەرلەنوێ پشکنەران لەمانگی چواری ئەو ساڵە هاتنەوە سەردانی ناوچەکە، دوای ئەوەش حکوومەتی عیراق ئێرانی تاوانبار کرد بەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی.

## ئەنجامێکی مەترسیدار

بەپێی راپۆرتی پزیشکانی ئێرانی دەرکەوت ئەوکەسانەی پشکنینیان بۆکراوە بە ئاشکرا دیارە برینەکانیان بەهۆی ژەهری یوپریت yperit تووش بووە. ئەو برینانە وەك برینی پێست، سووتانی پێست کە ئەو جۆرە برینانە پێویستیان بە چەند مانگێك هەیە بۆ چارەسەر لەبەر زەحمەتبوونی چاکبوونەوەیان.

ئەو نەخۆشانەی کە هەڵمی (یوپریت) یان هەڵمژیوە، کزۆری کارێکی زۆری کردۆتە سەر سییەکان و بۆڕی گەروویان، ئەو نەخۆشانەش زۆر جار لەحاڵەتی مردنیان تێدایە. ئەوانەی ماویشن ژیانیان زۆر لە مەترسیدایە و دەبێ بەردەوام لە نەخۆشخانە لەژێر چاودێری پزیشکیدابن.

بەڕاستی دیمەنێکی دڵتەزێن و خەم هێنە لە پێش چاوت کچێکی کوردی تەمەن چوارساڵە بەهۆی ژەهری یوپریت بە ئازارێکی زۆر کۆچی دوایی کرد.

لە ساڵی ۱۹۸۷ تیمی شارەزاکان بۆ یەکەم جار رووبەڕووی قوربانییەکان بوونەوە لە دانیشتوانی کوردستان.

رایانگەیاند کە خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی کوردستان تووشی ئەو کارەساتە بوونەتەوە و بوونەتە قوربانی گازی دەمارەکان. هەندێك لە قوربانییەکان کە لە نەخۆشخانەکانی خورەمشەهر چارەسەر دەکران دوای دوو حەفتە بەرەو چاکبوون دەبوون.

دکتۆر ئولریچ ئیمۆبێستك جارێکی تر نووسی: تیمی شارەزاکان لە کۆتاییدان رێککەوتن کە پێویست ناکات ئامێری تەکنیکی رەوانەبکرێ لەبەرئەوەی ئێمە راپۆرتەکانمان بە بەڵگە چەسپاندووە و رەوانەکردووە.

## ناوچەکانی مەترسیدار

لەبنەڕەتیدا چوار ناوچە کێشەی لەسەرە کە پەیوەندی هەیە بە یارمەتییەکان و دەرگایەکیشە بۆ فاکتەری سیاسی جۆراوجۆر، بەواتایەك کە پەیوەندییەکی

تایبەتی هەیە بەدەرەوە و لەو ناوچانە گرووپە یەکگرتووەکانی کوردی کۆنترۆڵیان بەسەر سنوورەکانەوە هەیە، ئەوەش کاریگەرییەکی سەرەکی هەیە بۆ هێرشی چەکی کیمیاوی وباری ئەو ناوچانە لەژێر کاریگەری گۆڕانی ئاو و هەوادایە لەچوار کەژی ساڵدا.

پسپۆرانی وەك ئیمۆبێرستك و رۆبینۆن بیروباوەڕیان وایە، بەهۆی شارەزایی و ئاگاداری خەڵکی ناوچەکانی سەرسنوور دەتوانرێ رێژەی قوربانیانیان لەدوو لەسەر سێ تا سێ لەسەر چوار کە متربێ.

بەپێی ئەو راپۆرتانەی وەگیراون لەسەر دابەشکردنی ئەو ناوچانە دەورپشتی O- I I I ولەڕووی شەڕی چەکی کیمیاوی سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێناوە بۆ یارمەتیدانی ئەم قوربانییانە.

وێنەی ژمارە (١١)

بڕوانە نەخشە نە لە سنووری سیاسی و لە نە لە ئیداری لەو ناوچانە O- I II نە یەکسانە لەگەڵ حوکمی زاتی ناوچەی کوردستان کە زۆربچووکترە ونە لەراستیدا زۆربەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە کورد و ئاسووری و تورکمانن. کە ١/٣ گەورەترە. ئەو دابەشکردنە تەنها لەرێگەی جوگرافی و کلتوورەوە یەکێکە و پارتە کوردییەکان کاریگەری راستەوخۆ و بەردەوامیان لەسەر نییە. تەنها ناوچەی سۆران —O- بە بەردەوامی لەژێر کاریگەری پارتی دیموکرتی کوردستانی عیراق و یەکێتی نیشتمانی کوردستان و هاوپەیمانەکانیدایە کە لەناوچەکانی I I Ia و b لێك دەداتەوە. لەرۆژئاوای قەرەداغ و خوارووی سنووری بەینی I I b وI I c هەتا دەگاتە خوارووی رۆژاوا، هێرشی پێشمەرگە کوردەکان زۆر بەخێرایی لە پێشکەوتنندایە و هەندێ جار دەگاتە ناوچەی کفری.

## چوار ناوچەکان

I نزیکەی ٢٥٠کم بەدرێژایی سنووری تورکیا، لەگەڵ بادینان(Ib) بارزان لە رۆژهەڵات، برادۆست (Ia) لە رۆژئاوا لە سێکوچکەی سنووری تورکیا وئێران و عیراق ناوچەی O، لە خواروو کە ناونرابوو بە Hamilton Road، دۆڵی بالیسان هەتا دەگاتە بەنداوی دەوکان و قەڵادزێ، و لە رۆژاوای سنووری ئێران ناوچەی I I لە رۆژئاواو خوارووی رۆژئاوا بەدرێژایی سنووری ئێران لەگەڵ ئەم ناوچانەی بابان، پێنجوێن، شارەزوو، و بەشێك لە هەورەمان لەگەڵ سلێمانی وەك بنکەیەك (سەنتەر).

ناوچەی I I I لە خوارووی ۆژهەڵات I I O– I لەگەڵ ئەم دەشت و زوورگانەی کشتوکاڵی لە دەوروبەری موسڵ، عێن سفنی، أربیل (هەولێر)، کفری.

ئەم زوورگ و کێوانەی کوردستان بە بەرزی ٢,٥٠٠م تاسنووری تورکیا و 3,600م تا سنووری ئێران دەڕوات.

## کۆنترۆڵی ناوچەکان (بازگە)

ناوچەی I لەژێر کۆنترۆڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی مەسعود بارزانی و ناوچەی I I لەژێر کۆنترۆڵی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەسەرۆکایەتی جەلال تالەبانی، و ناوچەی O لەژێر کۆنترۆڵی هەردوو پارتەکەیە. ناوچەی I I I هەردوولا جموجۆڵی و هێرشی پاریتزانی چالاکانەی لێ دەکەن. لەپایزی ساڵی ١٩٨٦ هێزە کوردییەکان پەیمانێکیان لەنێوان خۆیاندا مۆرکرد و(بەرەی کوردستانی) یان پێکهێنا بۆ مەبەستی هاوکاری یەکتر بۆ خەباتی چەکدارانە و پەیوەندی نێوانیان لە هەموو ناوچەکە لە ١٧ – ١٨/ تەمووزی ١٩٨٧ کۆنفراسێکیان بەست لە راژان کە پارتی سۆسیالیستی کوردستان و پارتی گەل بەشداریان تێدا کرد وبڕیاریاندا سەرکردایەتی گشتی (القیادة العامة) لەلایەن هەموو پارتەکانەوە بەرەیەکی یەکگرتوو پێکبهێنن.

ئەو سەرکردایەتییە سیاسییە پەیوەندی لەگەڵ هەموو پارتەکان بکات و دەبێتە دەمڕاستیان پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دەرەوە. وەك حیزبی شیوعی عیراقی کە ساڵەهای ساڵە شۆڕشی چەکدارییان هەیە لەناوچە ئازاد کراوەکان وپەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ (حزب الدعوە)ی شیعی پێکهێناوە بۆ بەشداری کردن لەم بەرەیە.

Peshmerga-Einheit in Irakisch-Kurdistan (Foto: Gérard Klijn)

**وێنەی ژمارە (١٢)**

**یەکەکانی پێشمەرگەی کوردستانی عیراق**

## دەزگای سەرەکی

سیاسی، عەسکەری، کارگێڕی و ئابووری تەندروستی هەردوو پارتە سەرەکییەکەی کوردستان کە پێکهاتووە لە هێزی پێشمەرگە بەیەکەوە یاخود بەتەنها. ئەو ناوچە کوردییانەیان کۆنتڕۆڵ کردووە و دەیانەوێ لەبارەی دادگاو دارایش رۆڵی خۆیان هەبێ.
لەبواری خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و پەروەردە و خوێندن و خزمەتگوزاری تەندورستی و...

لەناوچەی Iو ناوچەی Oکە ئەم دوو ناوچەیە (بادینان و سۆران) دەگرێتەوە لەژێر چاودێری PDK پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق — دایە.

وە لەم ناوچانە نزیکەی (١٢) نەخۆشخانەی سەفەری هەیە کەشانبەشانی هێزی پێشمەرگەکان لە گوازتنەوە دایە.چوار پزیشکی گشتی و یەك پزیشکی ددان و (١٠) یاریدەری پزیشکی و (٢٤) برین پێچ بەشداریان لە پێکهێنانی نەخۆشخانەکان کردووە.

لە ناوچەی I I و ناوچەی O کە ئەکاتە ناوچەکانی سلێمانی و سۆران لەژێر بەرپرسێتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە puk. کە لەرێگەی سیاسەتی ئیدیۆلۆگی باشتر پێك هاتبوو.

لەبەر ئاسانی پەیوەندیکردنی کوردەکان لە سنووری ئێرانەوە کاریگەری باشی خستبووە سەر باری عەسکەرییان کە لەلایەن سوپا سالاری ئێرانییەوە یارمەتی دەدران و بەیەکگەیشتنیان زۆر لەناوچەی بادینان ئاسانتربوو.

یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەرکی بەرێوەبردنی حەوت نەخۆشخانەی سەفەری لەنزیك سنووری ئێران بەرێوە دەبرد. لەوانەش پێنجیان بەباشی رێکخرابوون بۆ نەشتەرگەری گەورە سیانیان بە بەنج لێدان و چواریان بۆ ئەشیعە. و (٤٠) یەکەی فریاکەوتنی خێرا و حەوت پزیشك و بیست و دوو یاریدەری پزیشك بەشدارییان تێدا کردبوو.

لەهەمان کات لە سنووری ئێران رێگاوبانی باش هەیە کە لۆری و ئۆتۆمبێلی گەورەی سەربازی پیادەڕوا و بۆتە دەرگایەکی سەرەکی بۆ ناوچەی O کە ناوچەی سۆرانە و

کوردەکان بێ کێشە سوودی لێ وەردەگرن بەتایبەتی بۆ ناوچەکانی Ia، O کە ناوچەی برادۆست و سۆرانە کە گەیشتنیان ئاسانە کە دوو لۆری یارمەتی داوودەرمانی پزیشکی کە لە خانە ((پیرانشەهر))ی ئێران بۆ ناوچەی رەواندز لەدیوی عیراق تا حاجی ئۆمەران لەژێر کۆنترۆڵی ئێراندایە و لەسەرەتای دەستپێکردنی جەنگ ئێرانییەکان بۆ جاری دووەم دەستیان کردەوە بە دروستکردنی رێگاویان لە (شنۆ)وە بەناو رێڕەوی کێلەشین تێدەپەرێ کە لۆری و ترێلەی گەورە دەگەیشتنە ناوچەی برادۆست و دەوروبەری هەر لە وێوەش بەسەر پردەکانی حاجی ئۆمەران و برادۆست بە ئۆتۆمبێلی لاندرۆڤەرو لەدواییش بەولاغ ئەگوێزرایەوە ناوچەکانی تر کە هاتوچۆیان دژواربوو. لەناوچەی بادینان Ib بەدرێژایی سنوور لەگەڵ تورکیا جێگای هەڵگرتنی مەواد و خۆراکی هەیە، بەڵام سوپای عیراق توانای هەیە رێگاوبانەکانی نێوان برادۆست Ia و بادینان Ib تۆپباران بکات.

لەناوچەی بادینان هەوڵدەدەن یارمەتی بازرگانی قاچاغ بدەن لە تورکیاوە بۆ ناو عیراق و کوردەکانی ناوچە ئازادکراوەکان ئەم جۆرە بازرگانییە هاندەدەن. یەك گونیە ئارد لەتورکیا لەکاتی ئاسایی نرخی پێنج دیناری عیراقییە کە دەکاتە (٣٠) مارکی ئەڵمانی، بەڵام ئەمڕۆ پێنج هێندەی ئەونرخە گرانتربووە. حکوومەتی تورکیاش لەناوچەسنوورییەکانی (هەکاری — سیرت) کۆنترۆڵیان بەهێزتر دەکەن نەك هەر لەبەر پارتی کرێکارانی کوردستان بەڵکو بەهۆی ئەو بازرگانییەش. هۆی ئەو گرانییەش لەمەوە هاتووە چونکە رژێمی عیراق ناوچەی بادینان بە هەموو هێزێکی تۆپباران کاول دەکا و کێڵگەکان دەسوتێنێ.

لەوەش مەترسیدار تر کە چەکی کیمیاوی بەکاردێنێ ئەم زەوی و زارانە تا چەندان ساڵ بەرهەمی کشتوکاڵی نابێ. و پێی دەڵێن (سوتاندنی زەوی) و هەموو جۆرە بازرگانییەکی قەدەغە کردووە بۆ ئەو ناوچەیە وربگرە لەهەندێ ناوچەی ژێرکۆنترۆڵی خۆشی وەك ناوچەکانی III

هەر لە ساڵی (١٩٨٦)ەوە رژێمی عیراق دەستیکردووە بە هەڵمەتی کوشتن و لەناوبردن و تەعریب کردنی گەلی کورد، بەتایبەتی ناوچەی بادینان لەهەموو ناوچەکانی

تر زەرەرمەندبووە و زۆرجار ژن و منالّ و پیر و پەککەوتە لەبرسان دەمردن و ئەشکەنجەی زۆریان تووش دەبوو. ئەو چوار ناوچەیەی بە هێڵی فیشخابور خابور ئالوکا — بەعشیقە — اربیل — کرکوك — کفری — قورەتو کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی عیراق تا خوارووی رۆژئاوا، لە ساڵی ۱۹۷۵ — ۱۹۷٦ پرۆسەی راگوێزان و بە عەرەبکردن بە فراوانی دەستی پێکرد کە نزیکەی ۲,٥۰۰,۰۰۰ دوومليۆن پێنج سەد هەزار دانیشتوانی کورد بوون (۲۰۰۰۰) بیست هەزار ئێزیدی کورد و۱۲۰/۰۰۰ سەد و بیت هەزار مەسیحی بوو وچەند هەزار تورکمانێك لەم ناوچانە دەژیان، لەوانە نزیکەی نیوملۆنیان رەوانەی خوارووی عیراق کران بە مەبەستی تەعریب کردنیان. و ۳٥۰/۰۰۰ تا ٥۰۰/۰۰۰ کەس تا ساڵی ۱۹۸٦ خۆیان لەدەست تەعریب کردن رزگارکرد و بەرەو ئێران رۆیشتن کە لەبەر فشاری لەرادەبەدەری عیراق کە سیاسەتی خاکی سووتاوی (سیاسة الارض المحروقة)ی وەك بەرنامە جێبەجێ دەکرد.

کوردە پەناهەندەکان ساڵی ۱۹۷٥
لەسەر سنووری نێوان عیراق و ئێران

وێنەی ئەلکسەندەر شتێر بەبێرگ

بەلام نزیکەی ٢٠٠٠٠ تا ٤٠٠٠٠ مەسیحی هەلاتن بۆشارە گەورەکانی عیراق بۆلای کەسوکاریان.

هەر لەسەرەتای شەڕی کەنداو هەزاران کورد روویان کردە ولاتانی ئەمریکا و کەنەدا و ئەوروپا و ئوسترالیا و لوبنان و هەزارانیشیان کەوتنە ناو بەرەی جەنگ.

ئەو شەڕە فراوانەی سیاسەتی خاکی سووتاو بەردەوام بوو و وای لەخەلکەکە کرد گیانی خۆیان نەجات بدەن و روو لە ئێران یاخود روو لەناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی عیراق بکەن کە لەژێر دەستی پارتە کوردییەکان بوو.

ئەم ناوچەیەش بریتی بوو لە: بادینان، سۆران، برادۆست، بابان، پێنجوین، شارەزوور و هەورامان کە نزیکەی ٢٥٠,٠٠٠ تا ٣٠٠,٠٠٠ کەسی تیادەژیان ئەو ناوچانەش کە بە بەردەوامی تۆپ باران دەکران و ژیانی تێدا ئەستەم بوو ٦٠٪ی ناوچەی بادینان بوو، ٧٥٪ی ناوچەی شەقلاوە بەسەرەوە، ٨٠٪ ناوچەی سۆران ٦٠٪ ناوچەی بابان، بەلام ناوچەی برادۆست ١٠٠٪ ژیانی تیا نەمابوو رێکخراوی کۆمەلایەتی جیهانی بۆ داکۆکی کردن لەنەتەوە هەڕەشە لێکراوەکان راپۆرتێکی خستە بەرچاو کە لەسالی ١٩٧٥ تا سالی ١٩٨٧ بۆتێکرا لەم چوار ناوچەیە (٣١٥٩) گوند و شارۆچکەیان خاپوورکردووە و تەنیا لە سالی ١٩٨٦ (٦٨٥) گوندیان تێکداوە لە مانگی شوباتی سالی ١٩٨٥ تا مانگی حوزەیرانی ١٩٨٦ (٨٧٠) گوندیان تێکدا.

لە نووسینگەی یەکێك لە بارەگاکانی (حزب البعث) لەناوچەی کوردەکان پلانێك دەرچووبوو بۆتێکدانی (٢٤٠) گوند و دەرکردنی دانیشتوانەکانی کە سەر بەپارێزگای موسل و دهۆك بوون و تا سالی ١٩٩٠ جێبەجێ بکرێ. پێشتریش تامانگی کانونی یەکەم – ١٩٨٧ (٧٢) گوندیان لەگەل خاك کردبووەیەك.

تەنها یەك رێگەی سەرەکیش مابۆوە لەنێوان شاری دهۆك و زاخۆ تادەگاتە فیشخابوور لەسەر سنووری تورکیا.

ئەو گوندە و شارۆچکانەی کوردستانی عیراق کەبەر تێکدان و دەربەدەرکردن کەوتبوون ناوچەی (پێنجوێن، تەوێلە، خورمال، بەرزنجە، قۆڕەتوو، گەلالە، قەرەداغ، شەنگال، ئاغچەلەر)بوو.

ئاگادارییەك لەرژێمی بەعس بڵاوكرایەوە بۆ فەرمانگە رەسمییەكانی میری لە هەڵبجە، خۆشناوەتی، قەڵادزێ، سەید سادق، رەواندز، خۆیان ئامادەبكەن بۆگواستنەوە چونكە ئەو گوند و شارۆچكانە بەم زووانە هەموو خابوور دەكرێن.

بەتایبەتی ناوچەی I I I كەناوچەی شەقڵاوە دەگرێتەوە و هەر بەناو لەژێر كۆنترۆڵی رژێم بوون. بەڵكو لە باكوور تا رۆژئاوای ئەم ناوچەیە لەژێر كۆنترۆڵی پارتە سیاسییەكانی كوردستان بوون و بەردەوام چالاكی شەڕی پارتیزانییان تێدا دەكرد و لەباری یاسایی و دادگا دەسەڵاتیان لەوناوچانە هەبوو و باج (ضریبة) یان لە خەڵكەكە وەردەگرت تا لە بەڵێندەرانی بێگانەش.

لەهەمان كات هێزی پێشمەگە بەردەوام بەرگری لەم ناوچانە دەكرد دژی تەعریب، بەڵام نەیاندەتوانی بەردەوام لەیەك شوێن جێگیربن. رژێمی عیراقیش لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە دەستیكرد بەدروستكردنی كۆمەڵگا زۆرەملێیەكان بۆ نیشتەجێكردنی كوردەكانی سەرسنوور.

ئەم كۆمەڵگانەش لە قوشتەپە، دیانا، هەریر، زێبار، بەحركە، قەرەتوو، دروست كرابوون.

ناوچەكانی IIobc كە گوندەكانی سەربە چەمچەماڵ و كۆیە و قەڵادزە و ناوچەی بابان لەژێر دەسەڵاتی رژێمی عیراق بوون، تا ساڵی ١٩٨٦ هەموو دانیشتوەكانی گواستنەوە و ناوچەكان ژیانیان تیانەما.

پێش دەستپێكردنی ئەو كارەش هەموو خەڵكەكەی ئاگادار كردبوو كە خۆیان ئامادەبكەن بۆ راگوێزان و هەر كەسێك دژی ئەو پرۆسەیە هەڵسوكەوت بكا ئیتر بەیاخیبوو لە قەڵەم دەدرێ و بەخائن و دژی دەوڵەت تۆمەتبار دەكرێ. ئەو ناوچانەی كە بەشێك لەدانیشتوانەكەی دژی ئەم كردەوەیەبوون، رژێمی بەعس لەنیسانی ١٩٨٧ بەچەكی كیمیاوی هێرشی كردە سەریان. ئەو یەكە پزیشكییانەی لەگەڵ هێزی پێشمەرگە دەسوڕانەوە نەیانتوانی چارسەری ئەو هەموو بریندارانە بكەن و زۆر زەحمەتیش بوو بیانگەیەننە ناوچەی ئازادكراوەكان و لەوێوە بەرەو ئێران و سووریایان ببەن.

ئەو بریندارانەی کە روویان بکردبایە نەخۆشخانەکانی ژێر دەسەلاتی رژێمی بەعس بۆ چارەسەرکردنیان، دەرگایان بەڕوودا داخرابوو و چارەسەرکردنیان قەدەغە کرابوو.

گواین رۆبێرتس لە ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٧ لە رۆژنامەی سوریش کە رۆژنامەیەکی سویسرییە، گوێبیستی دووشاهید بووکە هیچ پەیوەندی و نزیکییەکیان لەنێواندا نەبوو. گوتیان: بەشێك لە بەرکەوتووانی چەکی کیمیاوی لەناوچەکە، توانییان خۆیان بگەیەننە نەخۆشخانەی سلێمانی بۆ چارەسەریی پزیشکی بەلام ئەوەندەی نەخایاند دار و دەستەی رژێمی بەعس هەلیانکوتایە سەر نەخۆشخانەکە و بریندارەکانیان بە زۆری فڕێ دانەسەر شەقام و منداڵێکیان هەر لەسەر پیلیکانەکانی نەخۆشخانە فڕێدرایەخوارەوە و لەبەر ئازاری برینەکانی هاواری دەکرد پاشان بەکاتی فڕێیاندانە مزگەوتێك. رێکخراوی کۆمەلایەتی جیهانی بۆ داکۆکی لە نەتەوە هەڕەشە لێکراووەکان لیستێکیان بەناوی (٤٢٦) کەس پیشاندا کە قوربانیانی گازی ژەهراوی بوون و لە نەخۆشخانەکان چاوەڕێی چارەسەری پزیشکی بوون، یەکسەر پیاوانی رژێمی بەعس کە سەر بە مخابرات) بوون، بەسەر نەخۆشخانەکەیان دادا و هەموو بریندارەکانیان بەرەو شوێن بزربوون بردن.

وێنەی ژمارە (١٤)

وێنەی ژمارە (١٥)

گوندی موساکا لە بادینان لە ساڵی ١٩٦١ تا ساڵی ١٩٧٥ کە پێنج جار تووشی شەڕ و کاولبوون بوو، دانیشتوانەکەی توانییان بەشێوەیەکی مۆدێرن دروستیبکەنەوە بە ئاشتی ژیانی تێدابەبەنەسەر. بەڵام دوای ساڵی ١٩٧٥ کاول کراو ژیانی تیانەما.

وێنەی ئەلکسەندەر شتێر بەبێرگ

## بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی

یەکەم هێرشی چەکی کیمیاوی بۆ سەر ناوچە کوردییەکانی عیراق لە ١٥/ ٤/ ١٩٨٧ بەرێگەی فڕۆکەی عیراق دەستیپێکرد. یەکەم جار ناوچەی سۆران (O) هەروەها ناوچەکانی دوکان و سەرچنار و ناوچەی (II a) و ئەو گوندانەی کەبەچەکی کیمیاوی تۆباران کران: علادین، بەرگەلۆو، کانی توو، ئاوەژێ، سیروان، چنارنە، نولێچکە، ئەم هێرشانە بەگازی ژەهراوی بەردەوام بوو تا ٢١/ ٤/ ١٩٨٧ و ئەو گوندانەشی گرتەوە کە لەناوچەس سۆران و خۆشناوەتی و دۆڵی بالیسان و دەورپشتی شاری سلێمانی و قەرەداغ.

هەروەها ئەو گوندانەی سەر بەشاری دهۆك و شارۆچکەی ئەتروش، باکرمان بەگازی خەردەل و هەندێ جاریش بەگازی فۆسیجین تۆپباران دەکران. لەمانگی مایسی ١٩٨٧ ناوچەکانی بادینان تاتوانییان لە گوندەکانیان دژی تەعریب بەرگرییان کرد، رژێمی عیراق ئەو ناوچانەی بەچەکی کیمیاوی بۆردومان کرد و هێرشێکی ئاسمانیشی بەچەکی کیمیاوی کردە سەر دەورپشتی شاری کەرکوك کە سەنتەری بەرهەمهێنانی پەترۆلە.

لە ٢٤/ ٥/ ١٩٨٧ ئەو ناوچانەی ماوەی ٢٠کم لە کەرکووك دووربوون وەك گورکان، تۆمار، تەماری شوان بەغازی خەردەل و یوپریت بۆردومان کرد. رژێمی عیراقی بەبڕێکی سنووردار چەکی کیمیاوی لەکارگەکانی فەلوجە و سامەڕا هەبوو، تا پاییزی ١٩٨٧ نەیدەتوانی بەردەوام چەکی کیمیاوی بەکاربێنێ بەزۆری.

بەڵام لە ئەیلولی ١٩٨٧ بەدواوە گەورەترین هێرشی چەکی کیمیاوی کردە سەر دۆڵی جافاتی کە لە نێوان شاری سلێمانی و قەڵادزێیە. و لە ٣ی ئەیلول زیاتر لە (٣٠) گوندی ئەو ناوچەیەی بەگازی یۆپریت تۆپباران کرد و هەندێکیان بۆ جاری دووەم و سێیەم تۆپباران کرایەوە.

لە ٦ی ئەیلول دەوروبەری شارۆچکەکانی شەقڵاوە و کۆیەی بەدرێژایی چیای سەفین بەچەکی کیمیاوی تۆپبارانکرد. بەتایبەتی ناوچەی هیران و نازەنین بۆچەند جارێك. جەلال تاڵەبانی – سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان سەرلەنوێ لە ٤/ ٩/ ١٩٨٧ راپۆرتێکی ئاراستەی سکرتێری گشتی رێکخراوی نێو دەوڵەتی (UN) – دی کویلار – کرد دەربارەی قوربانیانی چەکی کیمیاوی کە ژمارەیان بە سەدان کەسە لە دۆڵی جافایەتی کە لەلایەن رژێمی عیراق هێرشیان کراوەتە سەرو بەهۆی نەبوونی داوودەرمان بۆتە کارەساتێکی گەورە بۆ بریندااران و ئەو خەڵکەی کە لەناوچەکە هەڵاتوون – بەتایبەتی ئەو بریندار و پەناهەندانەی کە گەیشتوونەتە ئێران لەو هێرشە ژەهراوییە خۆیان دەرباز کردووە لە ١٧ی ئەیلولی ١٩٨٧ فڕۆکەکانی رژێمی عیراق هێرشێکی چەکی ژەهراویان لە جۆری یوپرێت و فۆسیجین کردە سەر ناوچەی بادینان

بەتایبەتی ئەو کۆمەڵگا زۆرەملێیانەی کە کورد و ئاشووری مەسیحی تیا بوون لە نزیك سنووری تورکیا دوای ئەوەی کە زیاتر لە ٥٠٠٠ کەس لەناوچەی دهۆك و ئەتروش و ئەلقوش لەدەست جەور و ستەمی سیاسەتی تەعریب خۆیان گەیاندبووە ناوچە ئازادکراوەکان.

و ژمارەی ئاسووری و مەسیحییەکان لە پەناهەندەکان زۆر بوو. و هەموو شارۆچکەکانی کانی ماسی و دەوروبەری هێرشی چەکی کیمیاوییان کرایە سەر.

ئەو ئیفادەی شیخ ئورمان کیرکابوو کە قەشەی سریانی بوو لەبەرواری باڵا. ژیانی پەناهەندەکان لەناوچەی بادینان کەوتە مەترسی و پارتی دیموکراتی کوردستان/ عێراق لە بەیاننامەیەکی دەریخست کە ٥٥٠٠ خێزانی پەناهەندە لەم ناوچەیەدان کە نزیکەی ٣٠٠٠٠ کەس دەبن، و ئەوانە لە بەهاری ١٩٨٧ هاتوون وەبەشێکی زۆریشیان لە کۆمەڵگای زۆرەملێی گەندی کانی هەڵاتوون. تورکیا بەهیچ جۆرێك رێگا نادات پەناهەندەکانی بادینان لە سنوور بپەڕنەوە ناو خاکی تورکیا و ئەگەر بپەرنەوە تەسلیمی رژێمی عێراقیان دەکا.

دانیشتوانی ناوچەی بادینان لە هەموولایەك دەوریان گیرابوو تا دەگاتە سنووری تورکیا و نزیکەی ٣٠٠کم لە سنووری ئێران دوور بوون. کە زۆربەی پەناهەندەکان تاکۆتایی مانگی ئۆکتۆبەر نەیانتوانی ئەو ماوەیە ببڕن. لەمانگی (١٠ — ١١ — ١٢) ی ساڵی ١٩٨٧ جارێکی تر سنوورەکانی تورکیا و ئێرانی ناوچەی کوردەکان بەچەکی کیمیاوی — گازی خەردەل و تابون فۆسیجین هێرشی کرایەوە سەر.

بەڵام رژێمی عێراق لە دەنگوباسەکان خۆی لەدرێژەی ئەم کارە درندانە دەپاراست. رێکخراوی جیهانی بۆ داکۆکی لەنەتەوە هەرەشە لێکراوەکان لە بەیاننامەیەك بڵاوی کردەوە کە رژێمی عێراق لەمانگی نیسان تا مانگی تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر)ی ساڵی ١٩٨٧ زیاتر لە ٢٠٠ گوندی لە کوردستانی عێراق بەچەکی کیمیاوی تۆپباران کردووە.

لە لیستێکدا کە زیاتر لە ٥٦٠ کەسی تێدا تۆمار کرابوو و ببوونە قوربانی چەکی کیمیاوی کە شوێنەواری ئەم چەکە لەسەر لاشەیان دیاربوو و بریندرەکان دوای ماوەیەك بەهەزارانیان گیانیان لە دەست داوە.

گواین رۆبێرتس:- بەقسەی شایەدعەیان لە بەیبانامەیەك ئاشكرای كرد، كە لە دۆڵی بالیسان فڕۆكەكانی رژێمی عیراق زیاتر لەبیست گوندی ئەو ناوچەیەی بەچەكی كیمیاوی تۆپباران كردووە- دانیشتوانی ناوچەكە هەرگیز پێشبینی ئەو كارەساتە چاوەڕوان نەكراوەیان نەكردبوو كە بەم جۆرە هێرشان بكرێتە سەر. پزیشكێك كە لە رێكخراوێكی كوردی بوو، بەچاوی خۆی ئەم هێرشیانەی دیتبوو و گوتی فڕۆكەكانی عیراق یەكەم جار دەوربەری گوند و شاخەكانیان بەچەكی كیمیاوی تۆپباران كرد بۆ ئەوەی دانیشتوانی گوندەكان هیچ پەناگەیەكیان نەمێنێ بۆخۆ حەشاردان لەكاتی بۆردومانی گوندەكانیان. دوای هێرشی شاخ و دەوربەری گوندەكان ئینجا بە گازی خەردەل هێرشیان كردە سەر گوندنیشتەكان. هەروەها وتی دانیشتوانی ئەو گوندانە چاویان دەسووتایەوە و نەیاندەتوانی لە پێش رووناكی چاویان هەڵبێنن لەبەر ئازارو كزانەوەی چاویان. پێستیشیان تووشی خوران دەبوو و ماكی سوور و رەش لەسەر پێستیان دەركەوت و تووشی تەنگە نەفەسی و كۆكەیەكی توند و بەردەوام دەبوون. هیچ دەسەڵاتم نەبوو یارمەتی دانیان تەنیا هەر سەیر كردنیان. منداڵانی زۆر كوێر بوون و زۆریشیان بوونە قوربانی و گیانیان لە دەسدا. ئێمە هەوڵماندا ئەو گژوگیا ومیوەو سەوزە بسووتێنین تاكو بتوانین تاڕادەیەك ئەم گازە ژهراوییەكە لەناوچەكە كەم ببێتەوە، بەڵام بۆنی تێژ و كاریگەری گازەكە ئێمەشی تووشی سەرەگێژە و وڕبوون كردبوو و بەسەدەها لاشەی مەڕو ماڵات و ئاژەڵ لەم ناوە لەسەر خاك كەوتبوو پێیستیان هەڵكڕووزابوو.

## قەزاوقەدەری گوندی شێخ وەسان

گۆڤارێكی كوردی بەناوی (پێشەنگ) كە لەلایەن پارتی دیموكراتی كوردستان/ عیراق دەردەچوو بڵاوی كردەوە كە ئەم گوندە سەرتاپای سووتێنراوە.

لەناوبردنی خەڵكی گوندی شێخ وەسان كە لە (١٥٠) خێزان پێك هاتبوو و ژمارەی دانیشتوانی لەنێوان ٤٥٠ تا ٥٠٠ كەس دەبوو كەوتبووە ناوچەی (٥) كە

ناوچەی خۆشناوەتی و دۆڵی بالیسانی بوو و لەباری کارگێڕییەوە سەر بەپارێزگای هەولێرە و نزیکەی ١٠٠ کم لە سنووری ئێران و بەرەکانی جەنگەوە دوورە —

رۆژی ١٦/ ٤/ ١٩٨٧ سەرلەبەیانی چەند دەقیقەیەك پێش سەعات حەوت، ١٢ دوازدە فڕۆکەی جەنگی لە جۆری سیخۆی سۆڤیەتی نزیکەی (١٥) دەقیقە بەسەر گوندی شێخ وەسان دەسوڕانەوە و سەدەها بۆمبی. کیمیاوییان باراندە سەر دانیشتوانی ئەو گوندە و جگە لە گوندی شێخ وەسان، گوندەکانی بالیسان و کانی بەردو توتمە و زێنێ و بیراوە و بالوکاوەش هێرشیان کرایە سەر بەچەکی کیمیاوی.

لەهەمان کاتدا (١٦) فڕۆکەی تر بۆمبی کیمیاویان فڕێدایە سەر زنجیرە چیاکانی هەریر و کاروخ و چیاکانی تر تا گەیشتە دەشتایی، ئەم هێرشە سەدان قوربانی لە بریندار و کوژراو لێ کەوتەوە و هەندێك لەبریندارەکان ئێش و ئازاریان ئەوەندە زۆر بوو وێنەی کەم بوو، بەتایبەتی دانیشتوانی گوندی شێخ وەسان هیچ کەسێکیان بەسەلامەتی لەم هێرشە دەرنەچوون. زۆر منداڵیان دەناشت بێ ئەوەی بیانناسنەوە، مناڵە کوژراوەکان تەمەنیان لە نێوان یەك رۆژ تا دەساڵ دەبوو جگە لە قوربانیانی مرۆڤی پیر و بەساڵاچوو کە تەمەنییان لەنێوان ٦٥ — ٨٥ ساڵ دەبوو.

## بەرهەمهێنانی گازی ژەهراوی بەیارمەتی کارگەکانی ئەڵمانیای یەکگرتوو

لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩٨٤ رۆژنامەی نیویۆرك تایمس گلەییەکی زۆری بەرامبەر دوو کارگەی ئەڵمانی بلاو کردەوە، ئەم کارگانە (کارل کۆلب / پیلۆت — karl kolb l\ pilot) کە لە شارۆچەی درایئایش نزیك شاری فرانکفۆرتە. ئەم دوو کارگەیە ئامێری تاقیکردنەوەی پێشکەوتوویان بۆ عیراق ناردووە گوایە بۆ دروستکردنی دەرمانی لەناوبردنی زیندەوەرە، بۆ ئەوەی بەم رێگایە رژێمی عیراق بتوانێ گازی ژەهراوی دروستبکا. رۆژنامەی فرانکفۆرتی گشتی کە رۆژنامەیەکی ئەڵمانییە بۆ رۆژی دوایی ئەم هەواڵەی بلاوکردەوە و دەزگای مخابەراتی ئەمریکی ئەگەڕا بەدوای

ئەو زانیارییانە کە دەست رۆژنامەی نیویۆرك تایمیس کەوتووە، کە رژێمی عیراق بەیارمەتی کارگەکانی ئەلمانی دەتوانێ گازی ئەعساب (Tabua) دروستبکات.

ئەم هەوالآنە لە هەفتەی رابردوو زۆر بە پوختی و بەوردی گەیشتە (ریگن) سەرۆکی ئەمریکا بەبێ ئەوەی هیچ کاردانەوەیەکی لەسەر هەبێ.

لە رۆژی هەینی جارێکی تر ئەم رۆژنامەیە هەواڵێکی لەسەر ئەو بابەتە بلاّوکردەوە، بەلاّم لە چەند سەرچاوەیەکی باوەڕ پێ نەکراو دەستی کەوتبوو لە وەزارەتی بەرگری وەزارەتی دەرەوەی ئاسایش ئەمریکی، کە ئەوان لەم بیروباوەڕەن کە عیراق ئەتوانێ لە چەند هەفتەی داهاتوو بەگازی ژەهراوی هێرش بکاتە سەر سوپای ئێران.

عیراق پێنج دەزگا و کۆگای بەرهەمهێنانی هەیە بۆ چەکی گازی ئەعساب، کە لەژێر زەمینی شەش نهۆمی لەژێر زەوی دروستکراوە و بە کۆنکریت سەری گیراوە. سەرکردەی هێزەکانی ئاسمانی پرسیاری کردبوو: ئایا فڕۆکەی جەنگی دەتوانێ بەسەر ئەو شوێنانە بفڕێ، بەلاّم ئەنجامێکی خراپی دەبێ چونکە لەو بڕوایەدان فڕۆکەکانی ئەفریکیش ئەو توانایەی نییە، ئەوە لیدوانی پێشەوای هێزی ئاسمانی بوو.

گازی ئەعساب پەیوەندی بە (Tabua) هەیە کە پسپۆرانی ئەلّمانی لە ساڵی ١٩٣٦ توانیویانە گۆڕانکاری بەسەر مادەی (nyt) بێنن کە تابون لە پێکهاتەی کیمیاوی کاریگەری هەیە و زۆر بە ئاسانی بۆ دروستکردنی داودەرمان پارێزگاری کشتوکاڵ دەبێ.

ئەم مەسەلەیە لەلایەن دبلۆماسییەکان ئاڵۆز بوو لەبەر ئەوەی دەزگای مخابەراتی ئەمریکی (CIA) کارگەکانی ئەلّمانی کارل/ کۆلپ لە درایئایش لە نزیك فرانکفۆرت بەرپرس کردن لە فرۆشتن و ناردنی تاقیگەی زۆر پێشکەوتوو و نوێ بۆ رژێمی عیراق کە ئەم جۆرە یارمەتییەی ئەدەن بۆ دروستکردنی چەکی کیمیاوی و ئەم کارگەیە بۆ ماوەی دووساڵ پێویستی بۆ عیراق ئەنارد.

(Nyt) هەواڵێکی لە (بۆن) ئەو کات پایتەختی ئەلّمانیا بوو – بلاّوکردەوە کە قسەکەرێك لە وەزارەتی ئابووری ئەلّمانی رایگەیاند کە کارگەی کارل/ کولپ،

کارگەیەکی تەواوکراوی ناردووە بۆ عیراق بۆ پاراستنی رووەك کە لە مانگی ئەیلول دەست بەکار بکات و یەکێك لە وەکیلی کارگەی پلیۆت هەواڵی فرۆشتنی ئەوکارگەیەی بە ناڕاست دانا، بەڵام وتی کارگەی ئێمە رۆژی هەینی تەنیا بڕێکی کەم ئامێری دروستکردنی ژەهر بەرهەمهێنانی ناردووە بۆ قەلاچۆکردنی زیندەوەری زیان بەخش.

لەهەمان رۆژ. لەسەر ئەم بابەتە قسەکەرێك خاوەنی کارگەکە لە بەرامبەر رۆژنامەنووسان وتی ئەمە تەنها پەیوەندی بە ئامێری توێژینەوە هەیە و ناتوانرێت بۆ دروستکردنی چەکی کیمیاوی بەکاربێت.

و خراپ بەکارهێنانی ئەو ئامێرە پێشەکی هەر لە پایزەوە دیار کەوت نەك بۆ دروستکردنی گازی دەمار (تابون) بەڵام ناشتوانی ئەم دەزگایە بەتەواوی قەدەغە بکەی بۆ دروستنەکردنی ئەم مادەیە (واتا رێی تێدەچێ). لەهەمان رۆژ (TAZ) ئەوەی زیاد کرد کە دەزگای هەواڵگری ئەمریکا (CIA) دەگەڕێ بەدوای ئەو پەیوەندییە کە لەگەڵ حکوومەتی ئەڵمانیا بەیەکەوە کاری تێدا بکەن و لە رۆژنامەی (لوس انجلۆس تایمس) بلاوی کردەوە کە ئیدارەی حکوومەتی رێگن دەیەوێ رێگا لە عیراق و ئێران بگرێت ئەو جۆرە مادەیان دەست کەوێ کە دەتوانن گازی خەردەل و چەکی کیمیاوی لێ دروستبکەن. و ئەوکارگانەی دەتوانن بێکێشە مادەی کیمیاوی بنێرن پێویستە رێگەیان پێ درابێ و بەردەوام نەبێ وناوی ئەو ماددە کیمیاوییانەی تیا نەنووسرابوو بەڵام باسی پێنج تاشەش مادەی کردبوو کە مەترسییان نییە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ مادەی ترتێکەڵ بکرێن دەبێتە مەترسی بۆ گیانی ئادەمیزاد تا رادەی مردن. هەروەها لە کارگەی پیشەسازییە کیمیاوییەکان باس لەسەر ئەوە کرابوو کە گازی خەردەل دەتوانرێ تێکەڵ بەم جۆرە ماددە بنەڕەتییانە (عنصر أساسی) وەك (ئیسلن، های درۆگن، دیشلۆرید، زولفورکلورید، سیدیۆگیگۆل) دەبێتە هۆی دروستکردنی.

. 13/3/1984 TAZ

پێش بڵاوکردنەوەی ئەو دەنگوباسە حکوومەتی ئەمریکی و ئەڵمانی زانیارییان لەسەر ئەوە هەبوو کە ئەو کارگانەی باسمان کردن وەك (کارل / کولپ و پیلۆت) گازی ژەهراوییان بۆ رژێمی عیراق بەرهەم هێنابوو و بە رێگەی دیبلۆماسی ئاگاداریان کردنەوە، بەهۆی ئاگاداری کردنەوەکەش حکوومەتی ئەڵمانیا لەمانگی شوبات ١٩٨٤ داوای کرد لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی سامانی کارگەکانی کۆلپ و پیلۆت بکرێت کە لە دەرەوەی وڵات هەڵگیراون.

لە ١٢ی نیسان ئەم حاڵەتە هاتە پێش. پەرلەمانی ئەڵمانی، پرسیاری کرد لە (گانزێل) کە ئەندامی پەرلەمان بوو و سەر بە پارتی سۆشیال دیموکراتی ئەڵمانی بوو، لە پرسیارەکەیدا وتی:

لێکۆڵینەوەی حکوومەتی ئەڵمانی (اتحادی) چ ئەنجامێکی بەدەستهێنا لەداواکردنی خاوەن کارگەکانی ئەڵمانی کە یارمەتی سوپای عیراقییان داوە بۆ دروستکردنی چەکی کیمیاوی؟

وەزیری دەوڵەت دکتۆر (مێرتس) وەڵام دەداتەوە:

حکوومەتی ئەڵمانی لەبەر ئەو هۆیەی کە پێشتر لەلایەن ئەمریکاوە زانیارییان پێگەیشتبوو، لەسەر ئەو زانیارییانە دەستکرا بەکارکردن لەسەر پشکنینی سامانی کارگەی کۆلپ لە دەرەوە. و لە کۆتاییدا ئەنجامەکەی پیشانیدا کە ئەم کارگەیە بەیەکەوە کاردەکەن لەگەڵ کارگەی پیلۆت لە فرانکفۆرت، کە ئامێری بچووك دروستدەکەن بۆ بەرهەمهێنانی مادەی کیمیاوی بۆ لەناوبردنی زیندەوەرە زیانبەخشەکان کە دەمێکە بۆ عێراقی دەنێرن. ئەم جۆرە ئامێرانەش لە زۆر وڵات بەکار دێت بۆ قەڵاچۆکردنی زیندەوەر وهەتا لە ئەڵمانیاش بەکاردێت. وپێویستی بە رێپێدان نییە لەلایەن حکوومەت. لەبەر ئەوە کارگەی پلیوت ئەو جۆرە ئامێرانە دروستدەکات کە ناتوانن گازی دەمار (أعصاب)ی لێ دروستبکرێ. چونکە بۆ دروستکردنی پێویستی بە ئامێری تەکنیکی و پێکهاتوو هەیە و ئەو جۆرە تەکنیکەیان پێ نەدراوە گانزێل SPd دەپرسێت:

ئایا حکوومەتی ئەلمانی نیازی وایە وەك حکوومەتی ئەمریکی بە توندوتیژی ڕێگا لەناردنی ئەو جۆرە ئامێرانە بگرێ کە دەتوانرێ چەکی کیمیاوی لێ دروستبکرێ و نەهێڵی بۆ عیراق رەوانە بکرێ؟

دکتۆر مێرتس: حکوومەتی ئەڵمانی لەلایەن حکوومەتی ئەمریکییەوە ئاگادارکراوەتەوە و هێڵی لە ژێر شتە گرنگەکان راکێشاوە و رەچاوی ئەوەشی کردووە کە لەگەڵ وڵاتەکانی بازاڕی ئەورووپی هاوبەش هەماهەنگی بکەن بۆ ئەوەی لێنەگەڕێن بەهیچ جۆرێك بەرهەمی کیمیاوی بۆعیراق بنێرن.

هەر ئێستا دەبێ لە بازاڕی ئەورووپی گفتوگۆ و کاربکرێت بۆ رێگرتن لەناردنی ئەو جۆرە ئامێرانە.

**پرسیاری گانزێل:**

ئایا وێدەچێ وەزیری وزەی ئیسرائیلی حکوومەتی ئەڵمانیا تاوانبار بکات بە تێوگلانی لەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەلایەن عێراق و کاریگەری لەسەر هەموو ناوچەکە بکاتە بیانووی داواکەی بۆ تاوانبارکردنی حکوومەتی ئەڵمانیا. وپێویستە ئەڵمانیا روونی بکاتەوە متمانەی بەوە هەیە کەبڵاوبوونەوەی سیاسەتی ناردنی چەك سنووری خۆی هەیە. وەلەبەرچی لێرەوەدەست پێبکات؟

**دکتۆر مێرتس:**

پێش هەموو شتێك ئەوەی لە ئیسرائیل دەبێت من تیگەیشتنم بۆی هەیە، بەڵام زمانی ئەڵمانی جیاوازی دەکات لە بەینی تێگەیشتن و رازیبوون.

وئەوەی دووەم من هیچ جۆرێك بۆ گومانلێکردنی ئەڵمانیای دانانێم.

دکتۆر دتیریش: SPD- سۆشیال دیموکرات – پرسیار:

بەرێز وەزیری دەوڵەت دەرفەتم پێ بدە کە جەخت دەکەمەوە لە سەر ئەوەی کە نووسراوێکم لەبەر دەستە کەقسەکەرێك لە ئیدارەی ئەمریکی بەناوی (هوگس) بۆ یەکەم جار ئەڵێ، کە حکومەتی ئەمریکی زۆر لە حکوومەتانی ئاگادار کردۆتەوە کە زۆر مکوڕە لەسەر دەسپێشخەری سیاسی.

وە چۆن بۆمان روون ئەکەیەوە کە ئەم جۆرە ئامێرانە لەزۆر شوێن دروست دەکرێ و CIA – دەزگای هەواڵگری ئەمریکی باوەڕیان وایە گازی ژەهراوی تەنها بە ئامێرەکانی ئەڵمانیا بەرهەم دەهێنرێن

**دکتۆر مێرتس:**

ئێمە دەزانین کە حکوومەتی ئەمریکا هەڵوێستێکی سنوورداری هەیە و حکوومەتی ئەڵمانی لە دە لایان کاری تێدا ئەکات بۆ ئەوەی بگاتە هەنگاوێك ئاراستەکەی دیاربێت . من هەموو گومانێك رەت دەکەمەوە، بەڵام جارێ وڵاتێك ئەگەر بیەوێ بگاتە ئامانجی خۆی و رێگایەکی بەسوود بەکاربێنێ بۆ ئەوەی هاوپەیمانانی بهێنێتە سەر هەمان ئەو رێگەی کە خۆی بەڕاستی دەزانێ.

**پرسیار/ گانزێل – SPD – سۆشیال دیمورات:**

بەرێز/ ئایا دەکرێ ئەڵمانیا وەك کاردانەوەیەکی گونجاو هەڵوێستی خۆی پیشانبدات بەرامبەر رای گشتی جیهانی و بایەخ بەوە بدات کە چەکی کیمیاوی بەیاسایەکی نێودەوڵەتی قەدەغەبکرێ، وحکوومەتی ئەڵمانیا فرۆکەوان و فرۆکە جەنگییەکان رابگیرێن تا ئەو کاتەی حکوومەتی عیراق دان بەوە دەنێ کە ئەو چەکانەی بەکاری هێناون لە یاسای نێو دەوڵەتان قەدەغە کراوە؟

**دکتۆر مێرتس:**

هاورێی بەرێز گانزێل، ئەوەی تۆ دەیڵێی دەبێ ئابلۆقەی لەسەر دابنێن، منیش ئەوە بەڕاست نازانم.

دوای ئەوەی دەرکەوت ئەمریکا لە دبلۆماسییەت دەسکەوتێکی نەبوو، پیشانیدا کە چەکی کیمیاوی عیراق هەڕەشەیەکە بۆ رێگەگرتن لە ئاشکرا کردنی نهێنییەکانی و هاوپەیمانانیش بۆلای خۆیان رابکێشن.

پاش بڕیاری رێگەگرتن لەنهێنییەکان حکوومەتی ئەڵمانیا زۆر بەخێرایی کار دانەوەی خۆی پیشاندا، کە لەو باوەڕەدان کارگەی کۆلپ / پلیۆت بەهیچ جۆرێك ئامێری دروستکردنی چەکی کیمیاوی بۆ عیراق نانێرن. لە ١٥/ ٥/ ١٩٨٤ فەرمانێك دەرچوو بۆ گۆڕانێك لە ئابووری دەرەوەی وڵات کە هەندێك رێپێدان پارێزی لێ بکرێت

وەك قەدەغەکردن لە ناردنی پێنج مادەی کیمیاوی بۆ عیراق کە گومان هەیە بەکار بهێنرێن لە دروستکردنی گازی ژەهراوی کە کاریگەری بۆ سەر گیانی خەڵکی هەیە و نەهێڵن زیان بەخەڵك بگەێنن.

هۆڵندا و ئەمریکا داوادەکەن بەلای کەمی هەشت لەو جۆرە مادە کیمیاویانە لە ژێر چاودێری بن. لە ١٩٨٤/٨/٦ حکوومەتی ئەڵمانی بڕیاریدا کە بۆ ناردنی ئامێری کیمیاوی بۆعێراق دەبێ رەزامەندی حکوومەت وەربگیرێ. بۆ ئەوەی بتوانن لەکاتی پێویست یەکسەر رایبگرن. بەتایبەتی ئەو تاقیگانەی بۆ ئەو کارانە بەکار دێن؟. حکوومەتی ئەڵمانیا لەدواییدا تارادەیەك خۆی بەبێدەنگ و ئارام پیشاندا.

وەلامێك لەسەر پرسیاری پارتی سەوز (ئەوکات حزبی ئۆپۆزیسیۆن بوو لە ئەڵمانیا) ئەو کێشەکێشەی خستەوە ناو دەنگوباسی رۆژانە. (چاپەکانی پەرلەمانی ئەڵمانی ١٠ – ٠/٧/ لە ١٩٨٤/٧/٢): کارگەی کۆلپ/ پیلۆت لە ساڵی ١٩٧٥ حەوت ئامێری تاقیگەی شووشەی بۆ ئەندازەگرتنی تەکنەلۆجی هەناردووە، کە لە ناو دۆسیەکانی ئەوکارگەی هەبوو بۆ پەرەسەندن لە بەرهەمهێنانی قەلاچۆکردنی زیندەوەری زیانبەخش.

سەرەڕای ناردنی دوو ئامێر بۆ بەرهەمهێنانی سەرەتایی بۆ گازی قەلاچۆکردنی زیندەودر.

بەپێی زانیاری بەدەسهێنراو لەو دوو کارگەیە (کۆلپ/ پلۆت)، هەر لە ساڵی ١٩٧٧ هەوڵدراوە بۆ ناردنی ئامێری کیمیاوی بۆ ئەندازەگرتنی تەکنۆلۆجی بۆ هەوڵکردنی ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان لە تاقیگەکان و شێوازی راڤەکردنیان بۆ کڕیارەکەیان لە عیراق هەناردووە.

وحکوومەتی ئەڵمانیا ناتوانێت هیچ زانیارییەك بدات لەسەر بڕی ئەو مادەیەی بۆ قەلاچۆکردنی زیندەوەری زیانبەخش کە بەم دوو ئامێرە بەرهەم دەهێنرێ و بۆ عیراق رەوانە کراوە.

جیاوازی نێوان بەرهەمهێنانی گازی قەلاچۆکردنی زیندەوەر و بەرهەمهێنانی چەکی کیمیاوی بەتێکۆشانی هەوڵەکانی پاراستن سەرکەوتنی دەبێت (بەرزایی تێپەڕینی هەوا، چڕی ئامێرەکان کە کاریگەری لەسەر فلتەری گۆڕانی هەوا) وەك دروستکردنی شوێنی تایبەتی و توێژینەوەی کەلوپەل و ئامێرەکان و حکومەت ڕێگاری داوە بەهەناردنیان. چونکە ناتوانرێ چەکی کیمیاوی لێ دروستبکرێ و پێویستی بە وەرگرتنی ڕەزامەندی حکوومەت نەدەکرد ئەم بڕیارەش لە ١٩٨٤/٧/٢ بوو.

لەسەر پرسیارێکی تری سەوز واخۆی پیشاندا، ئایا حکوومەتی ئەڵمانیا ئەتوانی ئەو دەنگوباسەی لە گۆڤاری دێرشپیگل کە لە ١٩٨٤/٧/٣٠ بڵاوکرایەوە کە ساڵانە (١٢٠٠) تەن لایەنگیری لێ بکات یاخود ڕەتی بکاتەوە؟ وەڵامێکی بێ سەروبەر لەسەر ئەم پرسیارە، حکوومەتی ئەڵمانیا بایەخ نادات لەسەر ئەوپڕوپاگەندەیەکە بیروڕای خۆی بۆ ڕۆژنامەگەری هەڵبڕێژێ، پرسیاری یەکەم وەڵام درایەوە حکوومەتی ئەڵمانیا تا ئێستا نەیتوانیوە هیچ شتێك بەدەست بێنێ لە بابەت ئیشکردنی ئەو ئامێرانە و دامەزراندنی تاقیگەکان هەروەك ئێوە لە پرسیارەکەتان ئەڵێن کارگەی ئەڵمانی بۆ عیراقی ناردووە، (نووسراوی پەرلەمانی ئەلمانی ١٠-٢٠٢٦ لە ١٩٨٤/٩/٢٤). لەسەرئەوەش حکوومەت بە پێویستی زانی کە فەرمانێك دەربکات لەبارەی سامان ئابووری کارگەکان لە دەرەوەی وڵات و لیستێك لە نێردراوەکانی کارگەی (کۆلپ/ پیلۆت) هەبێ بەرێگەی ڕەزامەندی حکوومەتەوە وهەناردنی چەکی گرنگ دەبێ لەژێر چاودێری یاسای ئابووری دەرەکی بێت.

دەبێ حاڵەتی وەرگرتنی ڕەزامەندی حکوومەت بۆ هەناردنی چەك بەردەوام بێ، بەڵام تا ئێستا هیچ هەوڵێکی جەختکردن نەدراوە کە بەرهەمی سەربازی لەدوای ئەم یاسایە نەنێرن، وەك بەرمێك کە جاڕدەدرێ بە (قازانج لە شەڕ).

ئایا هاوپەیمانان یەك جاریش جەختی لەسەر کردۆتەوە؟

پێش هەفتەیەك گۆڤاری دێرشپیگل پرسیارێکی ئاراستەکرد لەسەر ئەو ئامێرانەی بەرهەمهێنان کە بەبڕێکی کەم بۆ قەلاچۆی زیندەوەرە.

ئێستا لەم کاتە کارگەکانی کۆلپ و پیلۆپ/ پلانت کە پابەندە بەکەسانەوە، دەزگایەکی گەورەی بەرهەمهێنانی کیمیاوی لەنزیك شاری سامەڕا لە عێراق دروست ئەکەن، کە لەبەرد و شیش و کۆنکرێت دروستکراوە بەناوی أحمد I و أحمدII.

ئەم دەزگایە توانای بەرهەمهێنانی قەبارەی (١٢٠٠) تەنی هەیە لە ساڵێك و بە بۆچوونی شارەزایانی ئەمریکی ئەم دەزگایە ئەگەر گۆڕانکارییەکی بچووکی بەسەربهێنرێ و بەخرایی بەکار بهێنرێ دەتوانرێ گازی ژەهراوی بەرهەمبهێنێ.

وەئەم کارگەیە هەر بەدەستی ئەنقەست لە بیابانێکی چۆڵ و لاچەپ دروستکرابوو سەریشی بەشێوەی سەیوان داپۆشرابوو و رووبەریشی (١٠) کم[٢] بوو. هەندێك لە بنایەکە پەنجەرەی تێدابوو بەڵام دیواری لە پێش کرابوو.

ئەنجومەنی وەزیرانی ئەڵمانی چوارشەممەی حەفتەی رابردوو بایەخی بەم پرۆژەیەدا کە لەوانەیە لە عیراق لەجێگایەکی دوورولاچەپ بەیارمەتی ئەڵمانەکان بازرگانییەکی لەم جۆرە بکرێت بە ئاگاداری کارگەی گۆلپ بێ یاخود بێ ئاگاداری ئەوکارگەیە وە بەپێی زانیاری واشنتۆن ئەوکێشەیە زۆر گەورەترە کە لەمەپێش هەڕەشەیەکی ترسناکە کە نامانەوێ بکەوینە گیروگرفت لە شەڕی نێوان عیراق و ئێران.

لە سەرەتای ساڵ نووسینگەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەڵمانی هەوڵیداکە ئەم خاوەن کارگانە دەست هەڵبگرن لەو بازرگانییە چەورە — بەڵام بێ سوود بوو، چونکە ئەو کارگانە بەپێی یاسای ئابووری دەرەوە رێپێدەرانەکانیان ماوەی مابوو. ئەو کارگانە داوای قەرەبوو دەکەنەوە بەملیۆنەها ئەگەر هات و حکوومەتی ئەڵمانیا رێگای ئەو جۆرە بازرگانییەی لێ گرتن کە زیانێکی زۆریان پێ دەگات. بەڵام وەزیری دارایی ئەڵمانی لە ئەنجوومەنی وەزیران ئەم قەرەبووەی رەت کردەوە بۆ ئەو کارگانەی لەگەڵ عیراق بازرگانی ئەکەن، وەزیری ناوبراو لەوە زیاتر هیچ چارەیەکی نەدۆزییەوە کە شارەزایانی بێ لایەنی ئەڵمانی بنێردرێنە عیراق بۆ پشکنینی ئەم ئامێرانە، بەڵام رژێمی عیراق تا ئێستا رەزامەندی نییە لەسەر ئەوکارە

(دێر شپیگل — ١٩٨٤/٧/٣٠)

## کارگەی پیلۆت/ پلانت بەرگری لە خۆی دەکات

بەفەرمانی وەزارەتی ئابووری ئەڵمانی/ گومرگی سەرەکی لە شاری (دارم شتاد) هەڵسا بەراگرتنی ئەو داواکارییانەی کە لە ١٩٨٤/٨/٢٩ پێشکەش کرابوون بۆ رەوانەکردنی ئەو کەلوپەلانەی دروستکردنیان تەواو بوو و وەك پارچەی ئامێر و دەزگا تر کە بۆ پیشەسازی کیمیاوی بەکاردێت.

داواکاری کارگەی پیلۆت/ پلانت – پێشوازی SEEP روونکردنەوەیەك لەلایەن ئەو کەسانەی کە بەرهەمی مادەی قەلاچۆکردنی زیندەوەر بۆ جێگایەکی مسۆگەر (عیراق) شاری سامەڕا لە باکووری بەغدا.

کارگەی پیلۆت/ پلانت بەرێگەی تەلەفۆن داوایەك تۆمار دەکات لە لایەن دادگای مالی کە لەشاری (کاسل) و سەر بەهەرێمی (هێسن)ە لە ئەڵمانیای یەکگرتوو، داوائەکات کە پێویستە گومرگی سەرەکی لەشارس (دام شدات) رێگابدات ئەم ئامێرەکیمیاوییانە رەوانە بکرێن کە تائێستا راگرتوون.

لە ١٩٨٤/١٢/١٤ دادگای مالی هێسن حەق دەدات بەداواکەی کارگەی پیلۆت/ پلانت وتیایدا ئەڵێت: ئەم کارگەیە بۆی هەیە دوایین ئامێربنێرێت بۆ عیراق بۆ تەواوکردنی دەزگاکە لە سامەڕا.

بڕیاری حوکم هیچ روونکردنەوەیەکی نەدا لەسەر ئەو پرسیارە کە ئایائەو ئامێرانە بۆ خزمەتی هاولاتی بەکاردێن، یاخود تەنها بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی کارگێڕ کە لەلایەن حکوومەتی ئەڵمانی کاریگەری نەبوو.

حکوومەت بڕیاری نەدا بەخێرایی ئەم فەرمانەی کارگێڕییە بگەیەنێتە ئەنجومەنی وەزیران بەڵکو بە سیستەمێکی دەوری، کە واتاکەی وا دەگەیەنێت لەبەر حاڵەتی رێپێدان نەدەکرا لەکاتی خۆی لای هەموو وەزیرەکان بپشکنرێت.

لەناوەڕۆکی داوایەکەدا گوترابوو، کەپەیوەندی بە ئامێری مەبەست جۆراوجۆرەکانی کە لە زۆر مەبەست ئەگەری ڕێپێدان هەیە، کە (بەتایبەتی پلان دادەنێ لە سەر دروستکردنی مادەی قەلاچۆکردنی زیندەوەر. هەروەها سەلمێنراوە کە وەکیلی کارگەکانی کۆلپ/ پیلۆت/ پلانت وادەرئەبڕێ کە گۆڕانکاری لەم ئامێرانە تەنها لای کارگەی پیلۆت/ پلانت لەوانەیە بکرێ، بەماندووبوونێکی زۆریش. عێراقیش لەم بارەیەوە زۆر بێ شەرمانە ئەم کارە وا دادەنێ کە هیچ تەکلیف ناکات. (ئەم ڕوونکردنەوە لە گۆڤاری (stera) ئەستێرەی ئەڵمانی لە ١٩٨٧/٢/١٢ بڵاوکرایەوە.

شارەزایانی هەواڵگری بە (٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠) پێنج سەد ملیۆن مارکی دە خەملێنن کە ئەوکات دەیکردە (٣٥٠,٠٠٠,٠٠٠) سێ سەد و پەنجا ملیۆن دۆلار کە حکوومەتی عیراق لە ساڵانی ١٩٨١ – ١٩٨٢ وەبەری هێنابوو تەنها بۆ قەڵاچۆکردنی زیندەوەر، کە باڵوێزی عیراق عبدالرزاق الهاشمی ئەمڕۆ وا رادەگەیەنی.

## ڕۆڵی حکوومەتی ئەڵمانیای یەکگرتوو لەسەر کارگەکانی ئەڵمانیا لە دروستکردنی مادده ژەهراوییەکان لە عیراق!

وا دەرکەوت کە حکوومەتی ئەڵمانیا بیری لەوە کردەوە کە یاسایەکی سەخت و ترسێنەر دەربکات بۆ ڕێگاگرتن لە ناردنی بەرهەمی کیمیاوی بەتایبەتی ئەو ئامێرانەی بۆ بەرهەمهێنانی کیمیاوی بەکاردێت و بەهیچ جۆرێك ڕێی پێ نەدرێ.

بەڵام بە وردبوونەوە دەردەکەوێت و جێی سەرسوڕمانە کە حکوومەتی ئەڵمانیا دوای دەربڕینی ئەم حوکمەی (کاسل) هیچ ماندووبوونێکی پێوە دیار نەبوو، چونکە بەپێی بۆچوونی ئەمانە دەبوایە کارگەی پیلۆن/ پلانت ڕێگای ناردنی بەرهەمەکانی نەبێ، کەچی دووبارە ئەم مافەیان پێ دایەوە.

بەئاشکراش دیار بوو کە لەدەرەوە هیچ فشارێکی سیاسی لەسەر حکومەتی ئەڵمانیا نەبوو بۆ ئەوەی بەرپرسیار بێ لە گۆڕانکاری یاسا، لە روویێکی ترەوە سەلمێندرا کە بە هەزاران لەسەری راوەستاوە بەرامبەر کارگەی پیلۆن/ پلانت لەبەر حوکمی (کاسل) کە حکوومەتی ئەڵمانیا دەیەوێ خۆی دوور بخاتەوە لە گۆڕانکاری یاسا لەبەر ئەوەی لەوانەیە بەملیۆنەها قەرەبووی بکەوێتە سەر. لەهەمان کاتدا دەتوانن واپیشان بدەن کە هەمووشتێ باسیکراوە ئەگەرچی توزێك کەموکوڕی هەبووە.

هیچ دەنگۆیەك لەسەر ئەوە نەبوو، ئایا ئەگەر داواکردنی قەرەبوو لەلایەکی ترەوە رابگیرێ و ئەگەر وابێ ئەوە هەموو بازرگانی سامەڕا فەشەلی دەهێنا.

بەهەر حاڵ ئەو کارگانەی ئەڵمانی کە بەشدارییان کردبوو لە دروستکردنی ئامێری گەورە بۆ بەرهەمی کیمیاوی لە سامەڕا کەم نەبوون.

Preussag- بۆ چارەسەری ئاو لە مادەی قەلاچۆکردنی زیندەوەر.

Herbige – بۆ دروستکردنی بیناو باڵەخانەی پێویست.

Hammer – بۆ پێویستییەکانی ساردکردنەوە.

هەروەها کارگەی (کڤاست – Quast) کە لەژێرەوە گرێبەستی لەگەڵ کارگەکانی کولپ/ پلانت ئیمزا کردبوو (داڕشتنی و چەسپاندنی و پەیکەری کیمیاوی) و کانزای تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە بۆیان ناردبوو.

رۆژنامەی (قدس پۆست و BBC بلاویان کردەوە کە دەبێ مەرج و رێنوێنی تایبەت دابندرێ بۆ گۆڕانکاری ئەو ئامێرانە کە دەبێتە هۆی دروستکردنی گازی ژەهراوی.

(قدس پۆست ١٩٨٦/٦/٢٤، BBCلە ١٩٨٦/١٠/٢٧)

بەتەواوی دیار نەبوو کە کارگەکانی ئەڵمانی چ رۆڵێك دەبینن لە دروستکردنی ئەم ژەهرەو روون نەکرا بۆوە، ئایا بۆ وێنە (Magirus Detz) بە (بارهەڵگری داڕشتنی تایبەتی – شاحنة الصیاغە الخاصە). بڕوانە وێنەی لۆرییەکە کە بۆهەناردنی بەم رێگایە بۆ سامەڕا یان بۆ ناوچەی گازی ژەهراوی لێ دروستکراوە

وەپێش هەموو شتێك نەیانهێشت روون بکرێتەوە کە ئەم لۆرییە بەیارمەتی کارگەی کۆلپ نەخشەی بۆدانراوە.

وێنەی ژمارە (١٦)
کارگەی کۆلپ/ پیلۆت
داوایەکی بەرزکردەوە دژی ئەو رێکخراوە کۆمەڵایەتییەی
کە بەرگری لەنەتەوە هەڕەشە لێکراوەکان دەکات

بەم وشانە دەستپێدەکات کە بازرگانێکی پیس لەکارگەی کۆلپ — کە ئەم کارگەیە کەلوپەلی چەك دەنێرێ وەك گازی خەردەل و بەرهەمی تابون (تابون جۆرێکە لەماددەی ژەهراوی) بۆ عیراق، بۆ سوود لێ وەرگرتنی لە شەڕی کەنداو.

لە هاوینی ١٩٨٧ رێکخراوی کۆمەڵایەتی کە بەرگری لەنەتەوە هەڕەشە لێکراوەکان دەکا لەجیهانی چوارەم سەرلەنوێ بەقسە هات ئەگەرچی پێش ئەوان رۆژنامەکانیش لەسەریان نووسیبوو بەڵام نەك بەجۆرێك کە رەوشتی تێدا رەچاوکرابێ بەڵکو تاڕادەیەك خۆیان لەواقع دوور خستبووە.

جیاوازی لەنێوان بڵاوکردنەوەی رۆژنامەگەری و راگەیاندنی فەرمی دژی رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان ئەوە پیشاندەدات کە رۆژنامەگەری وەسفێکی بابەتییانەیە.

حوکمی دادگا له شاری بۆن ٧٠٣٤٩/٨٧ له ١٩٨٧/٨/٤، ئەو رێکخراوە کۆمەڵایەتییە له ژێر هەڕەشەی سیستەمی سزایی پارە و دووبارەکردنەوەی ئەم قسانە قەدەغەکرا. کارگەکانی کۆلپ/ پیلوت/ پلانت بە بەردەوامی رادەگەیەنیّ کە ئەم ئامێرانەی ناردوویەتە عیراق چەکی کیمیاوی لیّ دروست ناکریّ.

لەلایەکی ترەوە قسە لەسەر ئەوە دەکەن کە حکوومەتی ئەڵمانی بەڵگەی بەدەستەوەیە بەرێگەی هەواڵگری ئەمریکا CIA کە کارگەی کۆلپ بەلای کەمی حەوت ئامێری ئەندازە گچکەی بۆ عیراق ناردووە، وچوار لەو ئامێرانە بەرهەمی مانگانەیان (٤٠٠٠) چوار هەزار لیترە. بۆ قەڵاچۆکردنی زیندەوەر یاخود بەکاردێت بۆ غازی ژەهراوی.

لەمانگی دوانزەی ساڵی ١٩٨٧ پارێزەری نێو دەوڵەتی لەشاری دارم شتاد فەرمانی دەرکرد کە ١٢ کارگەی ئەڵمانی پشکنینی تێدا بکرێت، لەو کارگانەش دووانیان بەناو ناسرابوون کە کارگەی ڤێت (Wet) لەشاری هامبۆرگ و دووەم کارگەی پرۆیس زاگ (preussag) لە شاری هانۆڤەر لەهەمان کاتدا کارگەی هوکست توختەرلورگی (Hoechst-Tochter Lurgi) بەنیازە هەمان جۆری دەزگا لەئێران دابمەزرێنیّ.

بەبۆنەی ئەو رووداوە نوێیە سەرۆکی پارتی سۆشیال دیموکرات کە ناوی ڤۆگل (Vogel) بوو لە نووسراوێك بۆ سەرۆکی وزیرانی ئەڵمانی کەناوی کۆل (Kohl) بوو، بەبیری هێناوە وە داوای لیّ کرد کە ئەم گومان و داوایانە پەسەند بکات کە کارگەکانی ئەڵمانی بەهیچ جۆرێك رێگایان پیّ نەدریّ وتووشی ئەو گیروگرفتە نەبن.

ئەندام پەرلەمانی پارتی سەوز کە ناوی (روست —Rust ) بوو داوای لەوەزیری دەرەوەی ئەوکاتی ئەڵمانی کرد کەناوی (گێنشەر — Ganscher) بوو کە بەئاشکرا زانیاری لەسەر ئەو لێکۆڵینەوانە بکات. وەزیری دەرەوە (گێنشەر) ناڕازایی دەربڕی لەسەر ئەوەی کە یاسای نێو دەوڵەتییان بریندار کردووە و حکوومەتی ئەڵمانی لەو کارە ناڕەوایە دوورخستەوە. لە ١٩٨٨/٣/١١ ئەندامی پەرلەمانی سۆشیال

دیموکراتیکە ناوی (گانزل) Ganol بوو، پرسیاری ئەوەی لەگێنشەر کرد پاش تووشبوونی کارگەکانی ئەڵمانی بەگیروگرفتەکانی لەم بارەوە.

## نهێنییەکانی سامەڕا

لە ١٩٨٦/١٠/٢٧ تەلەفزیۆنی BBC -1 کە لەبەریتانیایە راپۆرتێکی بڵاوکردەوە، بەرنامەیەکی پیشاندا لەسەر پێکهاتەکانی دەزگای کیمیاوی لە سامەڕا، ئەمەش دەقی وەرگێڕانی بەرنامەکەیە لە ئینگلیزی بۆ ئەڵمانی.

**رۆبێرت هاریس:**

پەنجا ساڵ پێش ئەمڕۆ نازییەکان چەکێکی شاراوەیان هەبوو کە هاوپەیمانان (وڵاتە یەکگرتووەکان نەیانبوو) کە جۆرێك بوو لە گازی ژەهراوی، کە لەکاتی بەکار هێنانی دوژمنەکانی بەرەوڕووی مردن — دەبردن، دەیتوانی ئاراستەی شەڕ بگۆڕێ.

سەدام حسێن کە سەرۆکی عیراق بوو، کارگەیەکی شاراوەی لە بیابان لە نزیك شاری سامەڕا دروستکرد، بۆ بەرهەمهێنانی گازی دەمارەکان.

ئەمڕۆ ئێوارە (پانۆراما- panorama) لەسەر ئەوە راپۆرتێك بڵاوئەکاتەوە، کە چۆن گارکەکانی رۆژئاوا یارمەتییان داوە.

کە یەکەم مۆدێرنی چەکی کیمیاوی لەجیهان بەرێگاوەبێ و ئەوکارگەو بازرگانەکانی کە مادەی کیمیاوییان بەچەند رێگایەکی رێکوپێك وتەگبیربۆکراو بە بارهەڵگر دەنارد، بۆ ئەوەی لە کۆنترۆڵی (تصدیر — ناردنە دەرەوە) دەربازبن.

**هاریس:** سەربازە ئێرانییەکان لە نەخۆشخانەی تاران، بوونەتە قوربانی چەکێکی ترسناکی جیهانی، غازی خەردەل. نزیکەی سێ ساڵ دەبێ کە رژێمی عیراق ئەم غازە بەکار دەهێنێت لە شەڕی کەنداو، لەوکاتەوە زیاتر لە (١٠,٠٠٠) دە هەزار سەربازی ئێرانی بەوچەکە کیمیاوییە کوژراو و برینداری تێ کەوتووە.

**رێنتۆن:** وەزیری دەوڵەت لە نووسینگەی کاروباری دەرەوە:

باوەڕ بکەن کە شتێکی وا ترسناك لەسەر ئەم چەکە هەیە، کە ترسێنەرە بۆ هەموومان وپێویست ناکات بیر لە ئاخری شەڕ بکەنەوە، چونکە من کە بیرم دێتەوە کە منداڵ بووم ماسك (قناع)م لە دەم و چاوم دەبەست و ترسێکی زۆر گەورەی لەسەر هەمووان هەبوو.

**هاریس:** ئێمە دەتوانین ببین بەگەواهیدەر (شاهد) لەبەکارهێنانی سامناکترین غازی ژەهراوی دوای جەنگی جیهانی یەکەم.

(٦٥٠,٠٠٠) شەش سەد و پەنجا هەزار ئێرانی خۆیان ئامادە کردووە بۆ هێرشێکی فراوان بۆ ئەوەی ئەو حەوت ساڵەی شەڕی کەنداو کۆتایی بهێنن بەسەرکەوتنیان. عیراقیش ئامادەیە بۆ بەرگری لەو هێرشە ئەو جۆرە چەکە بەکاربهێنێ بۆ ئەوەی سەرکەوتن بۆخۆی بێ.

توندڕەوانی دینی لەئێران بەهەموو جۆرێك هەوڵیاندەدا لەو شەڕە سەرکەوتن بەدەستبێنن، هەرچەندە رژێمی عیراقی ئامادەیە چەکی کیمیاویش لە دژیان بەکاربێنێ.

**کۆکەر- مخابەراتی ئەمریکی:**

لەوە دەترسان کە رژێمەکەیان لەناوبچی، لە بەر ئەوە بڕیاریاندا هەموو جۆرە چەکێك بەکار بێنن بۆ ئەوەی هێرشەکانی ئێران سەرکەوتوو نەبن. ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە، ئەگەر فڕۆکەکانی رژێمی عیراق بەم بیروباوەڕە بۆی بچن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئێرانییەکان بڕیاریان لەسەر ئەوە دابوو کە هێرشێکی زۆر فراوان بکەنە سەر هێزەکانی عیراق، هێزەکەش پێك هاتبێ لە پاسداران و خۆبەخشەکان کە باوەڕیان وایە تامردن لەم رێگایە بەردەوام بن.

هاریس: دکتاتۆری گەورە صدام حسێن بەهەموو توانایەوە کۆنترۆڵی هەموو لایەکی ئەو شەڕە دەکات و لە ساڵی ١٩٨٣ فەرمانیدا کە چەکی کیمیاوی بەکار بێنن. پانۆراما بەڵگەی هەیە کە عیراق گازی ژەهراوی وەبەرهێناوە، وبوونی چەکی

کیمیاوی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەوە هان دەدات کە هیچ لایەك نەتوانێ سەرکەوتن بەسەر لایەکی تر بەدەستبێنێ.

ڕژێمی عیراق دەستی بەسەر ناوچەیەکداگرت کە ڕووبەرەکەی ١٦٠کم٢ دەبوو و ٤٠کم٢ لە خوارووی شاری سامەڕا بوو و هاتوچۆی بۆ ئەو ناوچەیە قەدەغەکردبوو. وێنەگرتنیش بەهەموو شێوەیەك قەدەغەبوو، ئێمە داوامان لە زانگیتی بازرگانی فەرەنسی کرد کەوێنەی ئەو ناوچەیەمان بۆ بگرێ (spot).

وادیار بوو لە بەرزایی ٥٠٠ میل زۆر بەگەورەیی دیاربوو و بۆ یەکەم جارە ڕژێمی عیراقی وا بەئاشکرا بترسێ و ئەو کارە بشارێتەوە، کە تۆڕێکی دایڕین بەدرێژایی ٤٠کم بە جۆرەها باڵەخانە کە وای پیشان ئەدا ئەم کارگەیە بۆ لەناوبردنی زیندەوەری زیانبەخش دامەزرێنراوە. ئەم جۆرە پروپاگەندانە لەلایەن شارەزایانی ڕۆژئاوا باوەڕپێکەر نەبوو.

**بالدیت:** ڕاوێژکاری زانستی کارگەی گازی قەلاچۆکردنی زیندەوەر وتی: بەبیروباوەڕی من ئەوانە هیچ پێویستییان بە پیشەسازی مادەی قەلاچۆکردنی زیندەوەر نییە. ئەوان پێویستییان بەبڕێکی کەم هەیە کە ساڵانە سەد تەن دەبێت.

**هاریس:**

لەسامەڕا زیاتر لەمادەی قەلاچۆکردنی زیندەوەر دروستدەکرێ بەپێی ئەو زانیارییانەی کە هەواڵگری ڕۆژئاوا بەدەستی هێناوە ئەو کارگانەی عیراق چەکی کیمیاوی دروستدەکەن و لەم جێگایە بەپانی ٢٥٠کم٢ لەهەموو لایەك زۆر بەتوندی چاودێری دەکرێ و هەموو کارگەکە دەوری بەتێلی دڕکاوی گیراوە. ئەو جێگایەیە کە بارهەڵگرەکان مادەی کیمیاوییان لێ دەهێننە خوارێ کە بۆ دروستکردنی گازی ژەهراوی بەکار دێ.

لە ڕۆژهەڵاتی کارگەکە ڕێگایەك هەیە نزیکەی (١٥) ڕێگای ژێر زەمینی جۆراوجۆری تێدایە و لەناو ئەم ژێر زەمینانە کۆگای زۆر مەحکەم دروستکراون کە هێرشی ئاسمانی ناتوانی کاری لێ بکات. باکووری کارگەکە بە دیواری کۆنکرێت

گیراوە. و لە ناوەوەش زیاتر لە (١٢) دوانزە کۆگاهەیە کە هەریەك تا ١٠٠ یاردە درێژە وە هەندێکیان هەر بۆ سەرلێشواندن دروستکراون بەدەستی ئەنقەست بۆ شێواندنی دوژمن لەهەر جۆرە هێرشێك و لە ناوەڕاستی ئەو کارگە ئالۆزەدا بەڕاستی گازی ژەهراوی دروستدەکرێ.

وا دەردەکەوێ بەرێگای مانگە دەستکردەکان ئەم زانیارییانە بەدەستهێنراون لەو بۆری و کەلەبەرانەی دووکەڵ و هەڵمی لێ دەچێتە دەرەوە.

لەم دەزگایە دوو گرووپ کاردەکەن کە ساڵانە هەزار تەن مادەی کیمیاوی دروستدەکەن و دەتوانن ئەم بەرهەمە زیاتریش بکەن. ئەم دەزگایە بەچەکە دژە ئاسمانییەکان SA2 دەپارێزرێ. لەساڵی ١٩٧٥ سەربازگەیەکی عیراقی لەسامەڕا دامەزراوە بۆ دروستکردن و ئەمبارکردنی چەکی کیمیاوی و نارنجۆکی دەستی.

**هاویس:**

ئەوانە چەند ساڵێکە ئەم کارگەیەیان دروستکردووە بۆ بەرهەمهێنانی مەوادی کیمیاوی بەرێگای بازرگانیش لە بازاڕی جیهانی کراوە.

**هاریس:**

ئایا ئەیانتوانی ئەم کارە بکەن بەبێ یارمەتی کارگەکانی رۆژئاوا.

**هاویس:**

من مەترسیم هەیە کە دەزگای تەکنیکی عیراق لەگەڵ دەزگاکانی دەرەوە بەیەکەوە کاریان کردبێ بۆ ئەم جۆرە پیشەسازییە.

**هاریس:**

رژێمی عیراق گازی ژەهراوی لە چەند جۆرە مادەیەکی کیمیاوی بەکار ئەهێنێ کە وێدەچێ لە رۆژئاوا دروستبکرێ، وەك شتێکی کاتیش لە پیشەسازی بەکاردێ چونکە ئەم مادده کیمیاوییە زۆر مەترسیدارە. بەتێکەڵکردنی لەگەڵ مادەی تر دەبێتە هۆی کوشتنی خەڵك. رۆژانە بە هەزاران تەن، گوایە کاتییە، ئەم مادە کیمیاوییە بۆمەبەستی ئەم جۆرە پرۆژانە دەفرۆشێ. ئەوکێشەیە لەلای هەواڵگری رۆژئاوایی

جیاوازییەکی وای هەبوو لەنێوان ئەو کڕیارە عیراقیانەی کە نیازیان باشە و ئەوانەی کە بۆ بەرهەمی چەك بەکاری دەهێنن.

**هاویس:**

لەراستیدا بەزۆری ئەم کیمیاوییە لە دووجۆری جیاواز بەکاردێت، کە بۆ پرۆژەی بازرگانی یاخود بەزۆری لەرێگای یاسا بۆ بازرگانی جیهانی، لەم حاڵەتانە کە ئێمە دەڵێین، جۆری تایبەت لەم مادە کیمیاوییە بۆ پرۆگرامی چەکی کیمیاوی بەکاردێ، ئەم کەسانە باش ناسراون لای ئێمە کە بازرگانی بەم مامەڵەیە دەکەن بۆ چ مەبەستێك بەکاری دەهێنن.

**هاریس:**

ئەو بەڵگەنامانەو دۆکۆمێنتی لامان هەیە و دەزانین کە ئەو رێکخراوە حکوومیانە بۆ مادەی قەڵاچۆکردنی زیندەوەر و لە ژێر چاودێری SEPP. و SEPP وەك بەشێك بێت لە رێکخراوی حکوومی کە بەرەسمی بۆ پیشەسازی کیمیاوییەوە ژمارەی سندوقی پۆستی تایبەتی لە بەغدا هەبوو و بەملیۆنەها دۆلار خەرج دەکرا بۆ ئەم مادە کیمیاوییە کە بۆ گازی ژەهراوی بەکار دەهات نەك بۆ قەڵاچۆکردنی زیندەوەر.

ئەو بێنەوبەردەیە نزیکەی پێش چوار ساڵ دەستیپێکرد. هۆڵەندا یەکێك بوو لەو بازرگانە شارەزایانەی کە بنکەیەکی بازرگانی جیهانی بوو. SEPP پێویست بوو سەرپەرشتی ئەوەبکات کە رێگا نەدات عیراق ئەو جۆرە میتۆدە بەکاربێنێ چونکە عیراقییەك راستەوخۆ نەدەچووە ناو دەزگا و کارگەکانی کیمیاوی نەوەك گومانی لێ بکرێ بەڵکو بەرێگای بازرگانەکان و لەسەر رێنوێنی حکوومەتی عیراق مامەڵەیان دەکرد.

لە سەرەتایی ساڵی ١٩٨٣ عیراقییەك کە پسپۆر بوو لە بواری کیمیاوی بەناوی دکتۆر (أل انی)- (ناوەکەی باش تێنەگەیشتم، وا بزانم ألکادیی بوو) کە بازرگانی دەکرد لەگەڵ کارگەی (پرویس زاگ- Preussag) و کارگەی W. E. T لە هامبورگ وەك پێناوێك لەنێوانیاندا. لێرەوە دەچین بۆ خواروی هۆڵەندا و لە نووسینگەی KBS کە کارگەیەکی بازرگانی بوو و بە فراوانی بازرگانی لەگەڵ عیراق ئەکرد.

دکتۆر (أل أنی) وتی من لە لایەن ڕێکخراوی دەوڵەت هاتووم بۆ بەرهەمی گازەکانی قەڵاچۆکردنی زیندەوەر. داوای لە KBS کرد کە (٥٠٠) پێنج سەد تەن لەمادەی (Thiodig lykol- تیودیگلیکۆل)ی بۆ بکڕن. KBS ئەم مادەی لەکارگەی کیمیاوی بەلجیکا کڕی، کە لقی کارگەیەکی ئەمریکی بوو بەناوی (مولیتس فیلیپ پترۆلیۆم- Maltis philip petrolem)، ئەم بازرگانییە نرخەکەی ملیون فوند کەدەکاتە زیاتر لەیەك ملیۆن دۆلار. لەمانگی حەوتی ساڵی ١٩٨٣ یەکەم کەشتی بەرێکەوت رووە و هۆڵندا و بەغدا- ئەم پرسیارمان لە رۆبین کرد کە سەرۆکی شارەزایانی سەربەخۆ بوو لە چەکی کیمیاوی: ئایا لەبەرچی عیراق ئەو مادەی Thiodig lykol تیودیگلیکۆلی پێویستە.

**روبینس:** مادەی تیودیگلیکۆل مادەیەکی گازی خەردەلە لەناو ئەو مادەیە تەنها هەندێك خوێی تێکەڵ بکەی و هەڵیشەقێنی، یەکسەر گازی خەردەل دروستدەبێ، ئەم جۆرە خوێیە بە ئاسانی لەدەرمانخانە دەستدەکەوێت.

**هاریس:**

چەند هەفتەیەك دوای گەیشتنی مادەی تیودیگلیکۆل عیراقییەکان یەکسەر دەستیان کرد بە دروستکردنی گازی خەردەل، بەڵام نەك بۆ نارنجۆکی تەقینەوە چونکە ئێرانییەکان شارەزاییان هەبوو لەبەر ئەوە ماسکی ئیسپانیان بەکار دەهێنا.

**یەعقوبی – سەربازێکی ئێرانی:**

لەکاتژمێر چوارونیوی پاش نیوەڕۆ کۆمەڵێك فڕۆکەهاتن بەکۆمەڵ و بۆمباکانیان رووەو سەربازەکان فڕێدەدا وبەردەوام بەرەو زیاد بوون دەچوون، کاتێك ویستم هەڵسمەوە و بڕوانم بۆمباکان لەکوێ کەوتوون، کە هەڵسامەوە هەستمکرد کە ئەوە گازی کیمیاوییە بۆنێکی زۆر پیسی لێ دەهات.

**هاریس:**

ئێرانییەکان بەو هەموو پروپاگەندەی کە پێوە هیلاك بوون ئەو باوەڕیان لای زۆرینە پەیدا کردبوو لە بەکارهێنانی ئەوچەکە لە لەلایەن رژێمی عیراق کاتێ کەیەکەم قوربانییان

بەم جۆرە چەکە گەیشتە ئەورووپای رۆژئاوا بۆ چارەسەکردن. پسپۆرانی چەکی کیمیاوی لە ئەوروپا یەکسەر زانییان کە ئەوە نیشانەکانی گازی خەردەلی ژەهراوییە.

**دکتۆر گرام پیارسۆن:** بەرێوەبەری کیمیاوی لە پرۆژەی بەرگری لە پرۆتۆن داون . دەلێ: گازی خەردەل کاریگەری لەسەر پێست هەیە ونچکەی گەورە (دومەڵ) لەسەر پێست دروستدەکات. هەروەها هێرش دەکاتە سەر سییەکان لەکاتی هەناسە هەڵکێشان و لە دوایی دەگاتە ناو ئێسك ودەبێتە هۆی مردن.

**هاریس:** ئایا هیچ چارەسەرێك نییە رێگا لە مردن بگرێ بۆ ئەوانەی کە بەهۆی گازی خەردەل بریندار دەبن؟

**دکتۆر پیار سۆن:** نەخێر، لەبەر ئەوەی گازی خەردەل کاریگەرییەکەی لە سەرووی ناوەندییە و بەهێزە-

**هاریس:** ئەگەرچی گازی خەردەل کاریگەری خراپی هەیە کە تەرووشك لەناو دەبات بەلاّم تا ئێستا بەچەکێکی سەرەتایی ماوەتەوە.

لەراستیدا هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهاتووە لەوەتەی بۆیەکەم جار لەساڵی ١٩١٧ لەلایەن ئەڵمانیا بەکار هێنرا ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ چەکی کیمیاوی مۆدێرن.

ئێمە دەمانزانی کە رژێمی عیراق بەدوای مادەیەکی قەلاّچۆکردندا دەگەڕێ بەلاّم سەربازانی ئێرانی بە ئاسانی لەمەسەلەی خەردەل تێگەیشتبوون لە ئەیلولی ١٩٨٣ حکوومەتی ئەمریکا داوای کرد بەنهێنی پشکنێکی جیهانی لەسەر بلاّوبوونەوەی چەکی کیمیاوی بکرێ. دەزگای هەواڵگری ئەمریکا هۆشداری دا کە عیراق دەستی کردووە بەهێنانی چەکی کیمیاوی و پرۆژەی بەرهەمهێنانی ئەوچەکە بەرێگای ئەورووپای رۆژئاوا و میسر، کارگەکانی ئەڵمانیش یارمەتییان دەدا بۆ بەدەستهێنانی گازی دەمار.

**هاریس:** رژێمی عیراق بەهیوایە پەرە بەگازی دەمار بدا ئەمەش زەنگی ئاگادار بوونەوە دەداتە رۆژئاوا بەریتانیا و ئەمریکا و سۆڤیەت لەم جۆرە گازەیان نییە. بەلاّم

له پۆرتۆن داون لەهەموو جییەك سەرپەرشتی ئەو پەرەسەندنە دەکەن لە ژێر پاریزگاری پرچەك بوون.

(دەنگێکی بەهێزی لەدوا دێ)، بەبێ کەرەستەی پارێزگاری ژیان مەحالە — و ئەم گازە رەنگ و بۆنی نییە و دەبێتە هۆی مردن بەرێگەی ژەهری دەمار، و ئەگەر بەر پێستیان کەوت، لەبەر ئەوە هەرچەندە ئێرانییەکان زۆر باش پارێزگارییان لە خۆیان دەکرد لەم چەکە کوشندارە، بەڵام شانسێکی ئەوتۆیان نەبوو لەبەرامبەر ئەو چەکە مەترسیدارە.

**دکتۆر پیارسۆن:** ئەو گازی دەمارە (١٠) دە هێندەی غازی خەردەل خێراترە بۆ کوشتن. ئەگەرهات و هێندەی کلوشەکرێك گازی دەمار ببێتە هۆێ کوشتنی ٢٥٠٠ کەس، هەمان هەندە لەگازی خەردەل دەبێتە هۆی کوشتنی ٢٥٠ کەس.

**هاریس:** گازی دەمار کاریگەری واپیشاندەدا کە هەموو ئەندامەکانی لەش دەلەرزێنی و دەبێتە هۆی رشانەوە و زگچوون و دوای چەند خولەکێك دەیکوژێ. چەندان تاقیکردنەوە کراوە لەسەر تووشبووان بەم گازە هیچ چارەسەرییەکی بۆ نەکراوە و ئەنجامەکەی هەر مردن بوو.

**دکتۆر پیارسۆن:** ئەوە شلەیەکە لە جۆری مادە پێ دەڵێن سارین، ئەگەر هات و سارین برژێنرێتە سەر زەوی دەتاوێتەوە وەك نەوت هەتا دەبێتە VX زۆر لینج دەبێ. لەوانەیە فێل بکرێ و ناوی گازی دەماری رەسەنی لێ بنرێ کەخۆی گازە رەسەنەکەنییە و گازی دەماری رەسەن بەهەر جۆرێك بێ کە بەر کەسێك کەوت رزگار بوونی نییە.

**هاریس:** چەند پێویستە لەم گازە بۆ کوشتنی کەسێك.

**دکتۆر پیارسۆن:** یەك دلۆپی زۆر بچووك.

**هاریس:** ژەهری دەمار لە ساڵانی سییەکان لە ئەڵمانیا لە پەرەسەندندا بوو و لە بنەڕەتەوەبۆ قەلاچۆکردنی زیندەوەر بیریان لێ کردبۆوە.

لەتاقیکردنەوە بۆیان روون بۆوە کە بۆ هەموو گیانلەبەرێك بکوژە. بەڵام نازییەکان بەکاریان نەهێنا، لەبەر ئەوەی تەکنەلۆجیا ئاسان بوو، هتلەر باوەڕی وابوو هاوپەیمانانیش هەیانە.

هەشت ساڵ دوای جەنگ دەرکەوت هەردوو ژەهری دەمار کە ناویان نابوو و سارین لەرێگەی ئەو داهێنەرەی کە دۆزیبوویەوە لەژێر چاودێری خۆی بوو، هەر کەسێك هەوڵی دروستکردنی هەبووا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکرد کە مەبەستی چییە لە دروستکردنی —لە گۆڤاری تەکنیکی رێگا هەبوو بڵاو بکرێتەوە.

لە بنەڕەتدا بەدوو رێگا بەرهەم دەهێنرێ:

١- لە دەزگای بەرهەمهێنانی SEPP کە لە سامەڕا جێبەجێ دەبێ

٢- کارلێکردنی کیمیاوی بەتێکەڵکردن لەناو دەوری و کارلێکردنیان تانکییەك بۆ شوشتن تانکییەك بۆشوشتن و تانکییەکیش بۆ فڕێدانی مادە بێ کەڵکەکان.

ئامێری دلۆپاندن: ئامێرێکە بۆ گۆڕینی کارەبا، چرکەرەوەیەك (مکثفة)و حەوزێك بۆ کۆبوونەوەی مادەکە لەکاتی بەرهەمی کۆتایی.

هەروەها ئامادەکردنی کەرستە سەرەکییەکان، پەمپێك بۆ وەدەستهێنانی بەرهەم وپێویستە بەردەوام بێ لەگۆڕانکاری کیمیاوی. بۆ نموونە سارین پەرە بە هیدرۆگن فلور دەدات. ئەم مادە کیمیاوییە زۆر بەخێرایی کار ئەکاتە سەر کانزا و شووشە. رژێمی عیراق هەوڵی ئەدا بەزووترین کات ئەو ئامێرانە بەدەست بێنێ.

بالدیت: بەداخەوە فرۆشتنی ئەو ئامێرانە لە هەموو دنیا بەردەوامە، کەکانزای کریمی پێ دەڵێن و دەستکەوتنی زەحمەت نییە، یا لەکانزای کریمە یاخود لە داوی شوشە و دەستکەوتنی زۆر ئاسانە و لە ئەڵمانیا دلۆپاندن و داوی شووشەبە ئاسانی دەستدەکەێ.

**هاریس:** لە ئەڵمانیای رۆژئاوا لە شاری فرانکفۆرت بەلای کەمی بەشێك لەو ئامێرانە بەرێگای SEPPدێت کارگەی کارل کۆلپ کە شوێنی بازرگانیکردنی لە ناوەندی شارە ئەم ئەنجامدەدات SEPP بەرێگای لقێکی ئەو شتانە دەنێرێت. وە ئەو کارگەیە واخۆی پیشاندەدا کە خۆی لەهەر پەیوەندییەك لەگەڵ عیراق دوور

خستۆتەوە. ئارمی کارگەی خۆی لەسەر کەلوپەلەکان لابردووە و ڕێگا نادات کەس لەم بارەوە گفتوگۆی لەگەڵ بکا.

بەڵام ئێمە باوەڕمان وایە کە ئەم پیاوە (کلوس فرانچل) چەند ساڵە بەرێوەبەری کارگەی (کارل کۆلپ)ە و نووسینگەی لە بەغدایە و خەریکی هێنانی توێژینەوەی زانستی و تاقیگەیە بۆ دامەزراندنی پرۆگرامی چەکی کیمیاوی لەعیراق.

کارگەی کڤاست لەساڵی ١٩٨٣ بەنهێنی گرێبەبەندێکی بەست لەگەڵ کارگەی کوالپ بۆئەوەی یارمەتی بدات، وە SEPP بە دووملیۆن فوند ئامێری پێ بدات، ئامێرەکانی کارگەی کۆست کە بۆ عیراق دەنێرێ گوایە بۆ بەرهەمهێنانی گازی قەلاچۆکردنی زیندەوەرە.

پێکهاتبوو لە لوولە و کالێکە کیمیاوییەکان و دەرخستەی دەنگی کە ئەوانە بەردەوام پێویستن بۆ پیشە سازی چەکی کیمیاوی.

هیچ بەڵگەیەك نییە کە کارگەی کفاست و کۆلپ ئەو ئامێرانەی بۆ سامەڕای دەنێرێ بۆ دروستکردنی چەکی کیمیاوی بێت. بەڵام لای ئەمریکییەکان بەکارهات کاتێ دەستیان کرد بە دروستکردنی مادەی (سارین).SEPP هەوڵی ئەوەیدا کە ئامێری دروستکرنی مادەی قەلا چۆکردنی زیندەوەر لە ئەمریکا ئاشکرا بکات، بۆی دەرکەوت ئەمە بەشێکە لە مۆڵەتی گەمە پێکردن.

لە شوباتی ١٩٨٤ ئەمریکییەکان لە فڕۆکەخانەی کندی لە نیۆیۆرك شتێکی گرنگیان دۆزییەوە.

فەرمابەرێکی گومرگ لەکاتی پشکنینی کەلوپەلی هەناردن لەکۆگای بەشی فڕۆکەی هۆڵەندی KLM بەرێکەوت چاوی بە (٧٤) تەنی کانزایی کەوت کە لەسەریان نووسرابوو (عیراق/ بغداد) کە بۆ دروستکردنی ئامێری دروستکردنی مادەی قەلاچۆی زیندەوەرە. بەڵام ئەم تەنانە کیمیاوی بوون و پێکهاتبوو لە (کالیوم — فلۆرید)، بۆ بەرهەمهێنانی گازی دەمار لە تابون و سارین، هەردووکیان پێکهاتەی کیمیاوی ئالۆزن.

وێنەی ژمارە (١٧)

بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە ڤێتنام، ئەو کردەوە دژ بەمرۆڤایەتییەی کە بەماوەیەکی کەم پێش راوەستانی شەڕ ئەنجامدرا، ئەم کارەساتە دڵتەزێن و ترسناکە چ ماڵوێرانی و دەربەدەریەکی بەسەرهێناین ئەوە راوەستانی کاتیی شەڕی مارینای ئەمریکی بوو لە (ئان هاو) لەخوارووی ڤێتنام لەکات پرۆسەکانی (Essex)

(مۆسیاقای رۆژئاوایی) لە ناش ویلی تێنس لەژێر ئەم ئەدرەسەدا دەپۆشراو بەم ناوە باری (کالیوم، فلۆرید) دەناردرا. بەم رێگایە ناردنی بارەکان جێبەجێ دەکرا. لەنووسینگەی کۆمپانیا بازرگانی برای حەداد کە گوایە ئامێری مۆسیقای رۆژئاوایین بۆ رۆژهەلاتی دەنێرێ.

(سعید الحداد) لە دایکبووی عیراقە، بەلام ئێستا ئەمریکییە و پشتگیری لە بازرگانی جیهانی دەکا. ئەم بارگواستنەوەیە لەرێگا ئەو جێبەجێ دەکرا. حەداد هەموو ساڵ بازرگانی لەگەڵ عیراق دەکات لە ئاستی سەد ملیۆن دۆلار، بەشی زۆری بازرگانییەکەی مامەڵەی گەنم و دانەوێڵەیە و لەگەڵ بەرهەمی تریش بەدوای هەیە، لەوانەش بازرگانی بە کەلوپەلی کیمیاوی، لەنووسینگەی خۆی رێگای نەدا گفتوگۆ

لەسەر [SEPP] بکەین بەڵام ئێمە دەزانین کە بەلانی کەم دوو جۆرە داواکاری لەوبابەتە هەیە وەك گازی دەمارەکان و کالیوم فلورید... دمیتل. میتفۆناتە، کە لە فرۆکەخانەی کندی و بەرێگای حداد نەیویست قسەی لەسەر بکات.

* کێ تکای لیٚ کردی ئەو مادە کیمیاوییە بنێری؟

- یەك دەقە چاوەڕوان بکە.

* کێ بوو ئەو کەسەی تکای لیٚ کردی؟

- بەداخەوە.

• بەڕێز حداد، تکایە بەڕێز حداد داوای لێبووردن دەکەم، بەڵام لە راستیدا دەبیٚ پرسیارت لیٚ بکەم، چی دەزانی لەسەر پرۆگرامی شەڕی کیمیاوی عیراق و تاچ رادەیەك جەنابت لەگەڵیان هەوڵت داوە بۆ ئەم کیمیاوییە، کە ئەوان بەهاوکاری تۆ دەستیان کەوتووە و بەکاریان هێناوە.

- من هیچ نازانم، من هیچ نازانم.

• تۆ باوەڕ دەکەی کە ئەم بارە لە فرۆکەی کندی راگیرا؟

- من ئاگادار نیم، جەنابت پێویستە لە ئەوان پرسیار بکەی —

• لەبەشی گومرگ، بۆ منیان روون نەکردەوە لەبەرچی بارێکی کیمیاویت بۆعیراق ناردووە؟

- هیچ لێت تێناگەم.

• چەند جاران هەوڵتدا لەبازارەکان کیمیاوی بۆ عیراق بکڕی؟

- تکات لیٚ دەکەم، بەڕوویەکی خۆش تکات لیٚ دەکەم نووسینگەکەم بەجیٚ بێڵە.

• لەچی دەترسی؟

- من لە هیچ ناترسم داوات لیٚ دەکەم هەرئێستا نووسینگەکەم بەجیٚ بێڵی.

**هاریس:** هیچ بەڵگەیەك نییە کە حداد زانیبێتی ئەو مادە کیمیاوییانە بۆچی بەکاردێن، ئەو دڵنیایە کەهیچ ئاڵۆگۆڕێکی بەقاچاغ نەکردووە. تەنها ئەو دەروازەی کەپشکنینی چوونە دەرەوەیە توانیویەتی ئەو مادەیە بۆ سامەڕا رابگریٚ. مانگێك

پاش ئاشکرا بوونی بار (شحن)ی حداد، لەمارتی ساڵی ١٩٨٤ لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە لە نەتەوە یەکگرتووەکان هاتنە ئێران بۆ ئەوە یەکەم کاریگەری تووشبوون بەگازی ژەهراوی عیراق بیین.

لە کۆتاییدا سەڵماندیان کە چەکی کیمیاوی بەکارهاتووە، وەزانییان کە بەرێگای بازرگانی رۆژئاوا هاتووە. بازاڕی هاوبەشی ئەوروپی و ئەمەریکی بڕیارێکیان دەرکرد کە دەبێ ناردنی ئەو جۆرە مادە کیمیاوییانە بۆ بەرهەمی گازی ژەهراوی بۆ عیراق قەدەغە بکرێ. هۆلەندییەکان فرۆشتنی دوو جۆرە مادەی کیمیاوییان قەدەغەکرد.

ئەمریکا و بەریتانیا بڕیاریاندا هەناردنی ئەو جۆرە ماددانە لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵێکی توندتیژبێت.

**رێنتۆن:** لەسەر ئەوەش ئێستا لیستێکمان دەرهێناوە کە (٣٥) جۆرە مادەی کیمیاوی تێدا تۆمار کراوە، کە دەتوانن بە تێکەڵاوکردنی مادەی ترسناك بەرهەمی کیمیاوی دروستبکرێ. و ئێمە لەسەر مادەکانی ناو ئەولیستە لەگەڵ (١٧) وڵات رێککەوتووین کە بەیەکەوە کاربکەین، و هەوڵی سیستەمێ وابدەین کە بەرهەمهێنە کیمیاوییەکانی خۆمان ئاگادار بکەینەوە.

ئەگەر هات و داوای ئەو جۆرە کیمیاوییەیان لێ کرا زۆر لەوانە وشیار و پارێزگاربن چونکە لەوانەیە بۆ بەرهەمی چەکی کیمیاوی بەکار دەهێنرێ.

**هاریس:** سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوونەی حکوومەتەکانی رۆژئاوا کە بەهاوکاری یەکتر کاریان دەکرد بۆ قەدەغەکردنی، کەچی پرۆگرامی گازی ژەهراوی لە عیراق نقوم بووە لە سەرچاوەکان و بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەشەڕی کەنداو بەردەوامە و دەزگای هەواڵگری باوەڕی وایە کە SEPP گازی دەماری لە کۆگا کەڵەکە کردووە، کە ئێرانییەکان لە هێرشی ئەمجارەیان زۆر بەهەزاران قەڵا چۆبکرێن پیشە سازی کیمیاویش زۆر گەورە و بەرفراوانە، لە راستیدا چاودێریکردنی ئاسان نییە.

**م. دراوبریدگە:** تۆ قسە لەسەر پیشەسازییەك دەکەی کە پەیوەندی بە بازرگانی جیهانەوە هەبێت کە لە (١٥٠) بلیۆن دۆلارو (٩٠٠٠) جۆر مادەی کیمیاوییە، ئەگەر

بتەویٚ بەدوای ئەو مادانە بگەڕێی کە دەردەچن و چەکی کیمیاوی لیٚ دروستدەکریٚ وەك ئەوە وایە کە دەرزییەکت لیٚ کەوتۆتە ناو کۆمەڵە گیایەکی وشك.

**هاریس:** وادیارە لە سامەڕا لەکاتی ئێستا چوارلقی بەرهەمهێنانیان دەبێت و بەرهەمم پاشەکشەیەتی، لەبەر ئەوەی ئەو مادە پێویستە هێشتا لە رۆژئاوا دەیکڕن.

**رینتۆن:** بەڕێوەبەری گشتی کۆمەڵەی پیشەسازییە کیمیاوییەکان:

بەداخەوە لەسەر ئەم زەمینە دەبیٚ جۆرە مرۆڤێك هەبن کە بازرگانی بە چەکی کیمیاوی بکات و ئامادەبێت بۆ قازانجی خۆی مامەڵەی پیٚ بکات کە تایبەتە بۆمردنی مرۆڤ.

**هاریس:** لە ئەیلولی ئەمساڵ دادگای شاری ئارانهایم لە هۆڵەندا کارگەیەکی ناوخۆی گوناهبار کرد، کە مادەی کیمیاوی بە قاچاغ بۆ عێراق ناردووە. ئەمە یەکەم حاڵەتە کە ئاشکرا بووە، (مێل شیمی) کارگەیەکی بازرگانییە و تایبەتمەندە بە بەرهەمی کیمیاوی و (٢٥٠) فەرمانبەری هەیە و چەند لقێکی لە بەغدا هەیە، ولەم ساڵانەی دوای گەورەترین سەرچاوە بوو بۆ (SEPP) و پاش ناردنی نامەیەك لەلایەن (SEPP) لە ساڵی رابردوو ئەو کارگەیە هەموو داواکارییەکەی بۆ نارد.

100 t. Thioy lchloride

20 t. Natriumfluorid

60 t. phosphor ti ch lorid

100 t. phosphor

150 t. Isopropy la min.

رۆبنسون: ئەو داواکارییە لە راستیدا هەمووی بە ئاگاهێنانە کە وا دیاربوو بۆ بەرهەمی چەکی کیمیاوییە. لەم حاڵەتەش دوو جۆری جیاواز لەگازی دەمار (فۆسفۆر تریکۆرید Phosphorticlorid) لەوانەیە بۆ تابون (Tabun) و ئەوی تریان، بەبیرو باوەڕی من بۆ سارین (Sariin) وئەوەی دەستدەکەویٚ لە (ناتریم فلۆرید — Natriumfluorid) کە بەکار دێت بۆ قەلاچۆی زیندەوەر وەك تێگەیشتبم.

**هاریس:** ئەو کەسەی ئاگاداری ئەو داواکارییەیە کارگەی (مێل شێمی ماناگینگ)ە و بەڕێوەبەرەکەی (زامکان)ە.

- ئایا دەتوانم لەگەڵ جەنابت گفتوگۆ بکەم لەسەر ئەو کیمیاوییە کە دەنێری، چیت بیر کردەوە و بۆچی بەکار دێت؟

- من بەلامەوە گرنگ نییە ... و تارادەیەك تێیناگەم.

**هاریس:** ئەو بڕە کیمیاوییەی لە کارگەی مێلشێمی هەناردراوە دەبێ لە سامەڕا هەڵبگیرێ. بەزۆری ئەو سزایانەی کە لەگەڵ SEPP لەسەر کۆنترۆڵی هەناردن ڕوودەدات، قەدەغە نەبوو. بەلاّم کارگەی مێل شێمی بەلانی کەم لەیەك حاڵەت کیمیاوی بۆ عیراق دەنارد و ئەم هەناردنە قەدەغە نەبوو.

ئەگەرچی لەلایەن حکوومەتی هۆڵەندی ئاگادار کرابوونەوە کە عیراق گومانی لەسەرە کە کیمیاوی لە ڕۆژئاوا دەکڕێ بۆ ئەوەی گازی ژەهراوی لێ دروستبکات.

ئەو بەسەر هاتە لە ١٩٨٤/٤/١٩ دەستیپێکرد کە تەلگرافێك لە بەغداوە گەیشتە نووسینگەی مێل شێمی.

قسەکەرێکی تر: ئێمە زۆر حەز دەکەین بزانین، ئایا لە تواناتاندا هەیە کە (٢٥) تەنPocl 3 بۆمان بنێرن لەگەڵ ڕێز و سلاّومان بۆتان. SEPP عیراق.

**هاریس:** Polc 3 مادەیەکی کیمیاوییە لە فۆسفۆر تریشلۆرید- Phosphortrichlorid و هەناردنی ئەم مادەیە لە هۆڵەندا قەدەغە کراوە بۆ عیراق.

**رووبینسون:** ئەو مادە کیمیاوییە دەتوانرێ کەلکی لێ وربگیرێ وبەرهەمێکی بەنرخە، ئەگەر هات و گازی ژەهراویت دروستکرد تەنیا دوو هەنگاوی بچووکی دەوێت بۆ دروستکردنی تابون — غازی دەمار.

**هاریس:** کارگەی (مێل شێمی) تەلگرافی بۆ هەموو کارگەکانی کیمیاوی ئەورپا لێدا بە بۆنەی ئەوەی کە دەیەوێ Pocl 3 بکڕێ بەلاّم لە بەر ئەوەی کۆنترۆڵێکی توندو تیژ هەبوو هەموویان ڕەتیان کردەوە بۆ عیراقی بنێرن.

لەو ماوەیەدا SEPP داواکارییەکەی فراوانترکرد بۆ (٦٠) تەن و لە سەر ئەوەش داوای دوو مادەی تری کرد کە بۆ چەکی کیمیاوییە. (٣) سێ مانگ بەسەرچوو لە ٧/٢ کارگەی (مێل شێمی) داوای لێبووردنی لە SEPP کرد لەبەر ئەو دواکەوتنە.

قسەکەرێکی تر: ئێوە بەدڵنیایی دەزانن کە هەناردنی ئەو جۆرە مادەیە پێویستی بە رێپێدانی هەناردن هەیە لە لایەن حکومەت. لەبەرئەوە پێویستیمان بە کات هەیە بۆ جێبەجێ کردنی داواکارییەکانتان، هیوادارین لێمان تێبگەن.

هاریس: ئەو نووسینە مۆر کرابوو لەلایەن (باس وای مان) کەبەڕێوەبەری ناردنی کەلوپەلی کارگەیە، (باس وای مان) پێویستی بە دوومانگ هەبوو بۆ ئەوەی کارگەیەك بدۆزێتەوە ئامادە بێت Pocl 3 پێ بفرۆشێ، لەسەرەتای پایز یەکێکی دۆزییەوە، لە ١٠/١٠ چووە ئیتاڵیا لە مایلاند لە هوتێلی ئەمریکان ژوورێکی بەکرێ گرت، ئەو کەسەی پەیوەندی لەگەڵ هەبوو ناوی (سینگۆر گاگلیاردی) بوو کە لە کارگەی کیمیاوی مۆتێدسیۆن ئیتالی بوو. کارگەی مۆتێدسۆن لەراستیدا وەك هەموو کارگەکانی تر داواکاری کارگەی مێلیشێمی رەت کردبۆوە، لەبەرئەوەی حکوومەتی ئیتاڵی لیستێکی لە کەلوپەلی کیمیاوی قەدەغە کردبوو بۆ عیراق بچێت.

Pocl 3 لەناو ئەو لیستەدا بوو، لەسەر ئەوەش وا دیاربوو ئەو کارگەیە هیچ ویژدانی نەبوو لەگەڵ کارگە مێلیشێمی، بەڵام کارگەی موتێدسیۆن ئامادە نەبوو لەمایلاند گفتوگۆ لەسەر ئەوەبکا. لەبەر ئەوەی حکوومەتی ئیتاڵیا دوو مانگ پێشتر کۆنترۆلێکی ناردنی زۆر توندوتیژی لەسەر Pocl 3 دانابوو.

خۆیان وا لێ بێ ئاگا کردبوو کە گوایە نازانین مادەی Pocl 3 دەبێتە هۆی دروستکردنی گازی دەمار.

وا دەرکەوت لە کۆتایی ئەو رۆژە کە کارگەی مێلشێمی مۆنتدسیۆن لەسەر ئەم بازرگانییە پێکهاتوون، و ئیتاڵی بەم کارەهەڵدەستن کە ٦٠ تەن لە Pocl 3 بۆعێراق بنێرن پاش شەش رۆژ (وایمان) توانی ئەو بازرگانییە لەگەڵ SEPP کۆتایی پێ بهێنێ.

لەو ماوەیەدا پێکهاتەی سامەڕا لە پەرەسەندنە بەیارمەتی کارگەکانی ئەورووپای رۆژئاوا.

کارگەی کارل کۆلپ تاقیگەی زیاتری هەناردووە و دابینکردنی پێویستییەکان لە کەلوپەلی پێویست لەلایەن کارگەی هێربیگەر لە ئەڵمانیای رۆژئاوایە کە زۆربەی باڵاخانە و بینایەکانی بۆ دادەمەزراندن. کارگەیەکی ئەڵمانی تر کەسەر بەکارگەی پرۆیس زاگ بوو ئامێری ئاوی بۆ دەناردن. کارگەی سایتاك کارگەیەکی ئینگلۆ هیندی بوو خانووی بۆ زانا پسپۆڕەکان لەکونکریت دروستدەکرد لەگەڵ هۆڵ و ژێرپردو ئیدارە.

کارگەی هامەری ئەڵمانی هەڵسا بە دروستکردنی هەوا فێنکردنەوە لە ناو هۆڵەکان بۆ (٦٠٠) کەس.

کارگەیەکی ئوستڕالی وۆرمۆلد هەستا بەسەرپەرشتی کردنی ئاگرکوژێنەوەکان و پاراستنیان لە سووتان.

بەشی زۆری ئەو دامەزراندنانە بە تێکڕایی پەیوەندی هەبوو بە کۆنترۆڵی سەرەکی لە سامەڕا کەچی هیچ پەیوەندییەکی نەبوو بە بەرهەمی چەك. بەڵام ئەم وەبەرهێنانە گومانی لێ دەکرێ کە ئەو پێکهاتە بتوانێ پەرەبسێنێ، لەبەر ئەوە ببێتە هۆی پێشبڕکێی چەکداربوون لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئاگرێك بەرپابکات.

**کۆکەر:** ئەگەر شەڕ کۆتایی هات، ئەوەمان لەبەرچاوە عیراق تا چ رادەیەك پێشکەوتووە، و پیشەسازییەکی وا فراوان کە بتوانێ چەکی کیمیاوی دروستبکات و بینێرێ بۆ لای تر و بەلای کەمەوە ناردنی تەکنیك لەوانەیە چەکیش بنێرێ.

**هاریس:** سەربازەکانی ئەمریکی وا فێرکراون لە چەکی کیمیاوی بترسن و پێویستە هەست بەکاریگەری ئەو غازە بکەن لەسەر لەشیان. لێم گەڕێ بچمە دەرێ تکایە لێم گەڕێ بچمە دەرێ.

**هاریس:** لەو رۆژانە سەربازگەی ئەمریکی بەخێرایی مەشقێك ئامادە دەکات، کە بزانن جیلی نوێی کیمیاوی چەند پەرەی سەندووە، لە کاتێکی وادا دەیکات کە غازی ژەهراوی لەسەرخۆ لە پیشەسازییەکان دەکێشێتەوە. بەڵام لە سامەڕا ئاماژە دەکرێ بەکۆتایی ئەو سەردەمە. بەتایبەتی گازی دەمار کە وەك هێزە گەورەکان هەیانبێ، تەکنەلۆجیا وا بڵاوبۆتەوە کە ئەمڕۆ زۆربەی وڵاتان دەیانەوێ ئەو چەکە بەدەستبێنن لەگەڵ بۆمبی ئەتۆمی کە بە پیاوە بچووکەکە ناوی دەرکردووە.

**روبنسون:** جیاوازی نێوان بۆمبی ئەتۆم و چەکی کیمیاوی زۆرە هەردووکیان چەکێکن کە مرۆڤ لەناو دەبەن بەڵام پیشەسازی چەکی کیمیاوی زۆرە و پیشەسازیی چەکی ئەتۆمی کەمە لەجیهان بۆیە لەوانەیە بتوانن چەکی کیمیاوی دروستبکەن بە بەراورد لەگەڵ چەکی ئەتۆمی. وەك مۆدێلی لێ هاتووە کە چەکی کیمیاوی لە هەموو پیشەسازیەکدا هەبێ، کە ئێمە ئێستا لەنێویدا دەژین و ئەو بڵاوبوونەوەیە دەتوانێ بەخێرایی سەرکەوتن بەدەست بێنێ.

**هاریس:** لەم ساڵانەی رابردوو چەکی کیمیاوی تاچ رادەیەك بەخێرایی بڵاوبووەتەوە؟

**کێنێت ئادلمان:** بەڕێوەبەری کۆنترۆڵی چەکی ئەمریکی و داماڵینی چەك: زۆر بەسەرسوڕمان بەخێرایی بڵاوبۆوە- لەناوەندی ساڵانی شەستەکان نزیکەی پێنج دەوڵەت لە دنیا چەکی کیمیاوییان هەبوو، بەڵام ئەمڕۆ (١٥) پانزدە دەوڵەت لە دنیا چەکی کیمیاوی هەیە و زۆر وڵاتی تریش هەوڵدەدات دەستی بکەوێ،

هاریس: بەفەرمی تەنها چوار وڵات هەیە کە چەکی کیمیاوی هەبێت ١- ئەمریکا ٢- فەرەنسا ٣- یەکێتی سۆڤیەت ٤- عیراق. بەڵام لیستی ئەوانی تریش هەیە.

دەزانین کە سوریا لقی بەرهەمی هەیە کە بەتەکنەلۆجیای رۆژئاوا بەکاری دەهێنێ بۆ ئەوەی سارین دروستبکات. ئیسرائیل لە هەواڵگری ئەمریکییەوە، کارگەیەکیان هەیە بۆ دروستکردن و هەڵگرتنی ژەهری دەمار لە دیمۆنا- بیابانی نیگین. خەڵك دەڵێن ئێران ئێستا چەکی کییاوی لە سوریا وەردەگرێ و هەوڵدەدات کە خۆی دروستیبکات. خەڵکانێکیش لەو باوەڕدان لیبیا بڕێکی سنووورداری لە ژەهری دەمار هەیە.

- بورما قسەی لەسەر هەیە کە بەرهەمی گازی خەردەلی خۆی هەبێت.

- تایوان یەدەگی پەنجا تەنی لەگازی خەردەل پلان کردووە کە ژەهری دەماری لێ دروستبکات.

- کۆریای باکوور (٢٥٠) دووسەد و پەنجا تەن لە ژەهری دەماری لە کۆگاهەڵگرتووە.

لەوانی تریش خەڵك زۆر کەم دەزانن. وەك: تەسیوبیا، پاکستان، کۆریای خواروو، چین، ڤێتنام، ئەفغانستان، کوبا، شیلی و خوارووی ئەفریقیا.

ئەوانەی ئەمڕۆ کیمیاوی دەفرۆشن بازاڕیان زۆرگەرمە، بەتایبەتی بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

ئیسرائیل لە سەرەتای ئەم مانگە دەستدەکات بە مەشق پێکردنی هاوڵاتیانی لە حەیفا بۆ خۆپاراستن لە هێرشی گازی ژەهراوی.

دەنگۆی وا هەیە کە چەکی کیمیاوی بایۆلۆگی بەکار بهێنرێ بەلایەنی کەم لە (١٦) شانزدە وڵات کە ململانێیان هەیە لە نێواندا لەم دەساڵەی رابردوو.

لەبەر ئەو هۆیانە ئێستا لە جنێف کۆبوونەوەیەك هەیە لەسەر دانوستانی کۆنترۆڵی چەك، و دەیانەوێ لەسەر قەدەغەکردنی هەڵگرتنی چەکی کیمیاوی رێکبکەون.

**دینتۆن:** لەسەر ئەو هەموو ماندووبوونەی ئێمە هەردوولامان دەیکەین، بەریتانیا هاوکارە لەگەڵ پیشەسازی مەدەنی ئێمە و بەیەکەوە لەکاردان لەگەڵ وڵاتانی تری بازاڕی هاوبەشی ئەوروپی و ئەمریکا، کەنەدا، یابان. بەڵام هێشتا بڵاوبوونەوەی روودەدات.

عیراق هێشتا پێداویستییەکان بەدەستدێنێ لەکەرەستەی کیمیاوی و کەلوپەلی بینای ئالۆز، بۆیە داوا دەکەین لە جێنێف کە هەموو شتێك قەدەغە بکرێت... و زۆر بەجیدی پشتگیری دەکەین لە کۆنفرانسی چەك داماڵین.

بە بیروباوەڕی من دەبێ دانانی چەك بە هەموو شێوەیەك قەدەغە بکرێ و کۆنترۆڵێکی توندوتیژی لەسەر بێت. بۆ ئەوەی بە دڵنیایی بتوانین بەرهەمهێنانی چەك رابگرین.

**هاریس:** کە چەکی کیمیاوی بە تەواوی قەدەغە بکرێ باشترین رێگایە بۆ سەپاندنی سزا دژی سەدام حسێن لەلایەن ئەوروپای رۆژئاوا، بە کەمبوونەوەی بەرهەمی چەکی کیمیاوی. بەڵام سەدام تائێستا توانیویەتی دژی هەموو کردەوەیەك و لێپرسینەودیەك وەڵامێك بدۆزێتەوە.

پرسیار: ئەگەر تۆ عیراقی بیت و بتەوێ ئەم قەدەغەکردنەی رۆژئاوا بۆ هەناردنی چەکی کیمیاوی دوور بخەیتەوە، دەتەوێ چی بکەی؟.

**رۆبنسۆن:** بەخۆت بیکەی زۆر ئاسانە چونکە چەند ڕێگایەکی تر هەیە بۆ ئەوەی کیمیاویت دەستبکەوێ، ئەگەر ڕێکەوت یەکێك نەیتوانی بیکڕێ، ئەو ژەهرە کە پێویستی پێی هەیە، لەوانەیە یەکێکی تر بتوانێت بیکڕێت و بەڕێگایەکی تر، ئەگەر هەر نا خۆت دەتوانی بیکڕی.

**هاریس:** تۆ دەتەوێ هەنگاوێك بگەڕێیەوە دواوە.

**رۆبنسۆن:** بەڵێ.

**هاریس:** بە تەواوی ئەوە ڕوویداوە، بەپێی ڕوونکردنەوەی مانگی دەستکرد، کە پرۆگرامی گازی ژەهراوی عیراق ئێستا مادەیەکی بنەڕەتییە لە کارگەی چەکی کیمیاوی لە نزیك شاری فەلووجە، ئەو کارگەیە دەتوانێ بەشێکی زۆر لە ژەهری دەمار دروستبکات. و پاشەکەوتی بکا بۆ کاتی پێویست. تا لە دەرەوەی وولأت ئەیکڕێ.

کارگەی دووەم لە سەلمان پاك بۆ لێکۆڵینەوە بۆ چەکی نوێ، ئێمە داواکاری نوێمان دیت و گومانمان لەوەیە کە عیراق لەگەڵ دوو مادەی ژەهراوی نوێ تاقی بکاتەوە (BZ و VX) ئەمەش شتێکی وەهمییە وەك نزیك بێت لە (LSD). لە ساڵانی شەستەکان ئەمریکاییەکان ئەمەیان تاقیکردەوە، کاریگەری ئەوتۆی هەیە کە لە کاتی جەنگدا دوژمن لەناو ببات.

(VX) لەسەر ئاستی چەکی کیمیاوییە لە ئەمریکا، چرپیەکی وەك ڕۆنی ئامێرەکانی هەیە کە لەوانەیە ژەهری دەماری ڕاستەقینە بێت.

لە ساڵی ١٩٨٤ جەنەراڵ (الرشید) پێشەوای فەیلەقی سێیەم بوو لە عیراق ئێرانییەکانی بە مێشولە چوواندن. و جارێشیدا، گوتی ئێمە زۆر بەختەوەرین مادەی قەلاچۆکردنی زیندەوەر بەکار دێنین بۆ لەناوبردنیان.

لە عیراق چەکی ژەهراوی دەمار لە زیادبووندایە کە ئێستا جەنەراڵ (الرشید) باسی لەسەر ئەوە کرد کە کاریگەری تەواوی هەیە بۆ قەلاچۆکردنی زیندەوەر لە هەموو دنیا. سامەڕا هێزی چەکداربوونی هەر بەرەو زیادبوونە کە پێویستە لە جیهاندا حسابێکی بۆ بکرێ.

## ئەو جەنگەی ڕێگای کۆتایی نییە

بە هەشتا کەشتی جەنگی ناتۆ خۆی ئامادەکرد بۆ بەرگری لە کەنداو.

لەو کاتەوەی ناتۆ دروستبووە یەکەم جارە بە گەورەترین هێزی سەربازی هەڵسن، بە تەنها ئەو دوو هاوپەیمانە بچووکە هوڵەنداو بەلجیکا شان بەشانی یەکتر بەدوو کەشتی بەدوای مین دەگەڕان. ئەڵمانیا کە ناوبانگێکی باشی نەبوو دوو کەشتی جەنگی زیادەی نارد بۆ دەریای ناوەڕاست. ئەو کارەیان ئەنجامدا بۆ سەربەستی لە دەریاوانی و دابینکردنی یارمەتی وزە بۆ رۆژئاوا و بەرگری لە بازرگانەکانی دەریا بکەن، چونکە لەمەو پێش کوژراو و بریندارییان لێ کەوتبۆوە. هەرچەندە ئەوەش ریسکێك بوو کە نزیك بوونەوە لە کێشەیەك کە لەوانەیە لەم پرۆسەیەدا بکەونە ناو جەنگ.

ئیمپریالیزمیش پێش بیست ساڵ (دوو عقد) لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتی دۆڕاندبووی بەڵام ئێستا دەریخست کە ژیاوەتەوە، تا چ رادەیەك بەهێزە.

شەڕی کەنداو حەوت ساڵی ڕەبەقی بەسەردا تێپەڕی و بەردەوام بوو و زۆر چالاکانە بە گەرم و گوڕی جۆرەها چەکی بۆ دەنێردرا. لە ساڵی هەشتەم کەشتی جەنگییان بۆ کەنداو نارد بۆ ئەوەی ڕێگە لە فراوانبوونی ئەو جەنگە بگرن و خۆشیان وەك هێزێکی یاسایی جیهانی پیشانبدەن. وەك ئاگر کوژێنەوەیەك بکەونە بەرچاو.

لە ساڵی ١٩٧٩ ڕاپەڕینی گەلانی ئێران وای کرد شای ئێران ئەو وڵاتە بەجێبێڵێ، لە خولەکی یەکەم دەرکەوت هێزی ئیمپریالیزمی جیهانی شکستی هێنا.

داخۆ باشتر نەبوو ئەگەر ئێران لە ستراتیژییەتی ئەمریکا و ناتۆ بمایە و دەورێکی سەربازی ڕێکوپێکی گرنگی دەبوو بۆ کۆنترۆڵی ناوچەی نەوت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

بەڵام لە قۆناغی دووەم ئەم پرسیارە هاتە ئارا، ئایا شۆڕشی ئیسلامی بۆ رژێمی ئیمپیریالیزمی جیهانی بەسوودتر نەبوو لە شا کە لە هەموو کات دڵنەوا نەبوو.

لە ئەیلولی ١٩٨٠ عیراق شەڕی دژی ئێران داگیرساند، چەند مانگێك پێشتر دژایەتی و تێسرەواندن لە نێوانیان لە سنوورەکان دەستی پێکردبوو، هەریەك لەلایەن خۆیەوە بانگەوازی لە گەلی وڵاتەکەی تر دەکرد بۆ ڕاپەڕین دژی رژێمەکەی و رووخاندنی.

ئامانجی عیراق ئەوەبوو ناوچەی خوزستانی ئێران داگیربکات، بە بۆچوونی عیراق ئەمە کارێکی ئاسان بوو، چونکە دانیشتوانی ناوچەکە عەرەبن و دەیەوێ ئازادیان بکا. ۹۰٪ی نەوتی ئێران لە خوزستان دەردەهێنرێ. ئێرانیش بەهۆی راپەڕینی گەل لە باری سەربازیی لاواز بوو و رژێمی نوێی ئێرانیش لە نێو کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی بەردڵ نییە، ئەوە بۆچوون و باوەڕی عیراق بوو کە بە ئاسانی لەو گەمەیە سەرکەوتن بەدەست دێنێت و بەهەڵە دۆخەکەی هەڵسەنگاندبوو کە گوایە ئەفسەرەکانی ئێرانی پەنایان هێناوەتە بەر عیراق بۆ ئەوەی لە عیراقەوە هەڵسن و تۆڵە بسێننەوە.

رژێمی عیراق چەند ساڵە دەنگێکی رادیکاڵی هەیە لە جامعەی عەرەبی، بەتایبەتی لەسەر کێشەی فەلەستین و ئەو هاوکارییە گومانی کردەوەی تیرۆریستی لێ دەکرێ، بەڵام لەم دواییە چووە ناو باوەشی رۆژئاواوە، یەکەم پشتگیری لەلایەن فەرەنسا بوو کە وایکرد رژێمی عیراق دەوری سەرکردایەتی وەدەست بێنێ و هەوڵیدا چەکی مۆدێرنی بۆ بنێرێ.

سعودیە و ئەردەن و وڵاتانی کەنداو پشتگیری عیراقیان کرد بۆ هێرشی سەربازی بۆ سەر ئێران، لە یەکەم قۆناغی شەڕ دەرکەوت کە سەرکەوتنێکی وا بەدەست نایەنن وەك کە خۆیان بۆی چووبوون.

هێزەکانی عیراق بە پانایی ۲۰ تا ۱۰کم و درێژایی ۶۰۰کم چوونە ناو خاکی ئێران و چەند شارێکی گرنگی ئێرانیان داگیرکرد وەك عەبادان، بەڵام ئێران توانی لە مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۸۰ بەرەیەکی بەهێز بچەسپێنێ و ئەو ناوچانەی لێی داگیرکرابوو جارێکی تر وەریانبگرێتەوە. و ئامانجیان ئەوەبوو نەك تەنها دوژمن لە ناو خاکی ئێران وەدەرنێن بەڵکو بەڕووخانی رژێمی عیراقی خوانەناس جەنگ کۆتایی بێ، لە مانگی حوزەیرانی ۱۹۸۲ ئێران توانی خاکی خۆی تاسەر سنوور هەمووی بخاتەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆی و شەڕی خستە ناو خاکی عیراق و بەرەو بەغدای پایتەخت پێشڕەوی دەکرد.

رژێمی عیراق تێگەیشتبوو کە لە یەکەم هێرش شکستی بەسەرهاتووە لەم جەنگە. بەڵام کار لەکار ترازابوو و تەنها ئەوەی لەبەرچاو بوو کە تووشی شەڕێکی درێژخایەن بووە.

لەبەرئەوە عیراق لە ناخەوە ئامادەبوو لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٨١ کۆتایی بە جەنگ بێنێ و شەڕ رابگرێ- بەڵام سەرکەوتنی نەهێنا، لەبەرئەوەی فوندامێنتالیستی ئێرانی مکوڕبوون لەسەر بەردەوامی جەنگ و جەنگ رانەگرن هەتا رووخانی رژێمی بەغدا و سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی شیعە وەدەست نەهێنن.

لەباری سەربازییەوە وەك گەمەی شەترەنج وابوو لەبەر ئەوەی ئێران سێ ئەوەندەی عیراق دانیشتووانی هەبوو، بەڵام لە بارەی چەك و تەکنەلۆجیای عیراقەوە تەرازووەکە وای لێ هاتبوو هەردوولا هاوسەنگ بن.

لەبەر ئەوەی هەردوولا بەردەوام خەڵکیان بۆ سەربازی بانگ دەکرد وایکرد ئەو جەنگە چەندساڵێك گەرم بێت.

## چەك لە شەیتانەوە بۆ ئیبلیس

لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٨٦ شتێکی زۆر سەیر لە میدیای جیهانی بڵاوبۆوە، خودی ئەمریکا چەك و کەلوپەلی جەنگ بۆ ئێران دەنێرێ! و بۆ ئیسرائیلیش دەنێرێ، کە گوایە دوژمنی دڵی فۆندامێنتالیستن و بەم رێگایە خزمەت دەکرێن. ئەمەش قۆزتنەوەیەکی قبووڵکراو نییە، ئەمە چ بیرکردنەوەیەکە. ئێمە نازانین و کەسیش ئەوە لەبیر ناکات چۆن وابڵاو بۆوە- ئەگەر ئەوە لەبیر کردن نەبێ کەواتە دەبێ نیفاق بێت.

پێش سێ ساڵ ئێران سەر شێتانە ئاشکرای کرد کە دەتوانێ بەدرێژی روونی بکاتەوە، چۆن ئەو کەرۆیشکەرۆیی، بۆ نموونە لە ١٩٨٣/١١/٢٣ لە (FAZ) دیاربوو چۆن چەکی ئەمریکی گەیشتە تاران، نوێنەرەکەشی ئیسرائیل بوو، ئێمە لەسەر ئەوە لێکۆڵینەوە دەکەین کە ئێران پەیوەندیدارە بە چەك و کەلوپەلی ئەمریکی.

حکومەتی ئێران لە سەردەمی شا محمد پەهلەوی لە حەفتاکان چەکێکی زۆری لە ئەمریکا کڕی کە نرخەکەی حەڤدە ملیار دۆلار بوو. ئەگەرچی ئەمریکا ئابلۆقەی هەناردنی چەکی لەسەر ئێران دانابوو لەسەر ئەوەش ساڵانە بەسەدەها ملیۆن دۆلار

وێنەی ژمارە (١٨)

چەك و کەلوپەلی سوپایی دەچوو بۆ ئێران. (FAZ) رایگەیاند کە چۆن ئەمە روودەدات، ئەمریکا چەك دەنێرێ بۆ هاوپەیمانانی وەك ئیسرائیل و کۆریای خواروو. لەوێوە بەنهێنی و بە ئاگاداری ئەمریکا دەفرۆشرێتە ئێران.

ئەو حاڵەتە لە ساڵی ١٩٨١ زۆر روون و ئاشکرا دیاربوو کە فڕۆکەیەکی ئیسرائیل لە خاکی سۆڤیەت کەوتە خوارەوە و (٣٦)تەن کەلوپەلی تەقەمەنی لە بەرهەمی ئەمریکا بارکردبوو و بۆ ئێران دەچوو. پێشەکی ئەمە جێگای سەرسوڕمانە کە فوندامێنتالیستی تاران ئیسرائیل بە دوژمنی گەورە و شەیتانی دادەنێ و ئیسرائیلیش هەوڵدەدات عیراق و لوبنان قەڵاچۆبکا، هەر ئەم ئیسرائیلەیە کە بەڵێنی داوە کە هەر وڵاتێك یا حکوومەتێك چەکی رۆژئاوایی بۆ وڵاتانی عەرەبی بنێرێ، بەردەوام دەکەوێتە ژێر هەڕەشەی ئیسرائیل. فۆندامێنتالیستی شیعەی ئێران گوایە دەیانەوێ ئیسرائیل لەناو ببەن.

مەگەر هەر حکوومەتی ئیسرائیل نەبوو کە حاشای دەکرد کە بەهیچ جۆرێك چەکی بۆ ئێران نەناردووە و لە داهاتووش نایەنێرێ.

مەگەر هەر رژێمی خومەینی نەبوو دەیوت هەناردنی چەك لەلایەن ئیسرائیلەوە پروپاگەندەکی هیچ و پووچە، کە زایۆنیزمی دوژمنی ئیسلام ئەم پروپاگەندەیە بڵاو دەکاتەوەو دەیانەوێ رێگا لە شۆڕشی ئیسلامی بگرن. ئایا کەس باوەڕ دەکا بەو گوتارانە کەچی دەڵێ.

# کەس ڕێگای نییە سەرکەوتن بەدەست بێنێ

وێنەی ژمار (١٩)

لە ڕاستیدا پاڵنەرێکی گرنگە کە ئەمریکا و ئیسرائیل هەوڵ دەدەن بەخێرایی چەك و تفاق لە سەرەتای جەنگەوە بگەیەننە ئێران، عیراق لەوانەبوو بتوانیت بەخێرایی سەرکەوتن بەدەست بێنێ. لەسەردەمی شاهەنشا ئێران هەموو چەکێکی لە ڕۆژئاواوە بۆ دەهات لە پێش هەموویانەوەش لە ئەمریکا و بەرگریشی لێ دەکرد بێ ئەوەی پێویستی بەهێنانی چەکیش بێت.

بەڵام چارەنووسی ڕژێمی خومەینی لە چەند حەفتەیەك یاخود چەند مانگێك دەردەکەوت. یەکەم عیراق هەڵوێستێکی بەهێزی لە کەنداو پیشاندا بەڵام بەپێی ئارەزووشیان نەبوو.

دووەم بەڵێنیدا کە ئەمە شەڕێکی دوورودرێژە، بەڵام شەڕ لەنێوان برایانی موسڵمان بەدۆڕان لە قەڵەم دەدرا.

بۆچوونێکی ترسناکە کە بەئاشکرا دەڵێ: باشە ئیسرائیل حەقی بەسەر ئەو شەڕە نییە ئەگەر هەتا زەمانێکی دوور و درێژیش هەر بەردەوام بێ، بەڵام هیوای گەلێکی بچکۆلەیە کە هەردەم لە مەترسیدایە.

(ڕۆژنامەی یەهودی حەفتانە لە ١٩٨٦/١٢/٥)

لەوانەیە ئیسرائیل بە تەنها لە مەترسیدا نەبێ، بەڵکو هەموو ناتۆ (NATO) لەژێر هەڕەشەیە، کە لەسەر ئەو ئامانجە رێککەوتوون کە ئەو جەنگە کۆتایی نەیەت، چونکە کۆتاییەکەی لەبەرژەوەندییان نییە. هەر کاتێك ئێران یاخود عیراق بتوانێ چەك بەدەستەوە بگرێ، دەتوانن پێشەکی پارەکەی بدەن.

هەتا بکرێ چەك بۆ هەردوولا بنێرن، بەڵام دەبێ ئاگاداربن ئەگەر هەرلایەك لەم شەڕە لە هێرشێك سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەواتا شەڕ کۆتایی هات، دەبێ ئاگاداری هاوسەنگی هێزی هەردوولا بن و بەرێگای زانیاری مانگی دەستکرد.

لەهیچ کاتێك ئەو جۆرە شەڕە لەنێوان دوو وڵاتی جیهانی سێیەم روویندەداوە، وقەت شەڕ ئەوەندەش درێژەی نەبووە و ئەوەندە چەکەش بەکارنەهاتووە. لە هیچ سەردەمێك نەبووە کە وڵاتانی زلهێز ئەم بازرگانییە لەسەر حیسابی دوو وڵات بکەن. قەت نەبووە هەردوولایەنیش رکابەری یەکتری بکەن لە توانای پارەدان بۆ چەك بە خۆشی و ئاسانی لە ساڵانی جەنگ.

عیراق لە سەرەتای جەنگەوە (٢١٠) ملیارد مارکی ئەڵمانی کە دەکاتە نزیکەی (١٣٠) ملیار دۆلاری ئەمریکی خەرج کردووە- بۆ پێداویستی جەنگ.

ئێرانیش (٤٧٠) ملیار مارکی ئەڵمانی کە دەکاتە نزیکەی (٢٨٠) ملیار دۆلاری ئەمریکی بۆ هەمان مەبەست خەرجکردووە.

ئەو جەنگە بەردەوامەی نێوان دوو وڵاتی دراوسێ کاریگەری کردۆتە سەر بارودۆخی وڵاتانی رۆژئاواو رۆژهەڵات.

ئێمە لەو ناکۆکییە راهاتووین، کە ناتۆ (Nato) خۆراکەکەی دەدات و لایەنەکەی دیش سۆڤێت پشتی دەگرێ. هەروەها لە جەنگی عیراق و ئێران یەکێتی سۆڤیەت چەك بەهەردوولا دەدات.

لەبارەی سەربازییەوە هیچ گرنگییەك پیشان نادات، بەڵکو هەر لایەك سەرکەوێت تەنها لە قازانجی گەلەکەی ئەو لایەیە کە لە جەنگ سەردەکەوێ. وەك بڵێ ئێمە بردمانەوە. شەڕی کەنداو ئایدۆلۆگی پروپاگەندەی سەرمایەداری دەخاتە بەرچاو، کە

هێزی ئیمپریالیستی دەیەوێ واپیشانی مرۆڤایەتی بدات کە دژایەتییەکی توندوتیژو فاناتیك لەنێوان ئەو گەلانە هەیە، کە نیوەشیان زیاتر شارستانین (حضاري).

لەبەر ئەوەی کەس بەرپرس نییە لەو کوشتارەی لە ئارادایە تەنها ئەو دوو لایەنەی کە جەنگ لەگەڵ یەکتری دەکەن. ئەو گەلانەی لە جیهانی سێیەم کە کۆلۆنی (مستعمرة) بوون سەربەخۆییمان بۆ بەجێ هێشتبوون و هەناردنی بەرهەمی چەك و تفاقی جەنگ بۆ شەڕی کەنداو هیچ تاوان نییە، بەڵکو لەناو دڵی ئابووری میللەتە کە دەتوانێ لە شوێنی کارکردن خەڵکێکی زۆر خەریکی پەرەسەندنی ئابووری بکا لە وڵاتانی پیشەسازیدا. وبەرهەمهێنانی چەك پێویست ناکا شەرم بکا، لەکاتێکا کە خوارووی کەنداو ئەو فناتیکە ئیسلامییانە بەبێ ویژدانی ئەو منداڵە هەژارانە دەنێرن وەك سووتەمەنی شەڕیان پێ گەرم دەکەن.

## بازرگانی کوشتار لە کەنداو

کەنداو لەو ئانە بازاڕێکی گەرم و بە قازانجە بۆ چەك فرۆشتن، زیاتر لە پەنجا وڵات بەشداریدەکات و لە ناویاندا (١٠) دە وڵاتی سۆشیالیستی بەشدارە، کە بە کۆمەڵی زۆر چەك دەنێرن:

١- نیوەی ئەوانەی چەك دەنێرن رێگایان هەیە چەك بۆ هەردوو لایەنی شەڕکەر بنێرن.

٢- هەریەك لە عیراق و ئێران لەسەریانە ساڵانە (١٢) ملیار دۆلار خەرجی جەنگ بدەن. کە دەکاتە تێکڕای داهاتی نەتەوەیی وڵاتێکی وەك سوریا، بەڵام لەژێرەوەی خەرجی سوپای ئەڵمانیای یەکگرتووە لە ساڵێکدا.

٣- خەرجی ئەو چەکانە لە بازرگانی نەوت دەدرێت، عیراق رێگای هەیە لە پارەی وڵاتانی کەنداویش خەرج بکات، شەڕی نێوان عیراق و ئێران بازاڕی نەوت دەخاتە تەنگوچەڵەمە.

عیراق دەتوانێ بەشێکی زۆر چەك بەرێگای رەسمی و ئاشکرا بەدەست بێنێ لەپێش هەمووان لە سۆڤیەت و فەرەنسا یاخود لە میسر (کە پشتگیری عیراق دەکەن).
لەو کاتەی کە ئێران پاش رووخانی شا ئابلۆقەی خراوەتەسەر لەلایەن ئەمریکا، ئێران تەنها بەرێگای بازاڕی ڕەش (قاچاغ) دەیتوانی چەکی پێویست بکرێ.
٤- ئەگەر هەناردنی چەك بەرەسمی لە زۆربەی ئەو ولاتانە رابگیرایە، ئەو شەرە زۆر بەزەحمەت دەیتوانی بەردەوام بێت.
ئەو کاتەی کە ئەمریکا داوای لە ئەنجومەنی ئاسایش کرد ئابلۆقەی چەك بخاتە سەر ئێران، بەبیروڕای (رۆژنامەی فرانکفۆرتی گشتی) کە رۆژنامەیەکی ئەڵمانییە، ئەوانە چۆن دەتوانن ئاگر بکوژێننەوە، کە تاڕادەیەکی زۆر خۆیان بەشداری کردووە لە ئاگر هەڵکردنەکە!؟.
٥- بە هەموو هێزیانەوە خەریکی ئاگرکردنەوە بوون، ناتۆ پێویستە لەسەری مینە ئیتاڵییەکان لەکار بخا، فەرەنسا و ئەڵمانیا بەیەکەوە کەشتییەکی جەنگیی ئەمریکیان تێکدا. لەو کاتەدا هێرشی (نەگەڕانەوە تا مردن) لەم شەڕە دەستپێکرد.
بۆ نموونە دەبێ هەندێك لە ناردنەکانی چەك بۆ شەڕ بخرێتە ناو لیست بۆ ناو زەدکردنی بە رێگای رەسمی و بەلام بەرێگای نهێنی دەنێردرێت.

## لەوانەیە بەرتیل وەربگیرێ

فەرەنسا سێیەمین ولات بوو لە جیهان لە ناردنی چەك بۆ دەرەوەی ولات، بەلام دوای ئینگلتەرا کەوتە زنجیرەی چوارەم. لە ساڵی ١٩٨٦ لە ٤٠٪ چەکەکانی نزیکەی بە نرخی (٣,٥) سێ ملیارونیو دۆلار هەناردە شەڕی کەنداو، لە پێشەوە عیراق کە سێ یەکی (٣/١) چەکەکانی لە فەرەنسا هێنابوو.
فەردنسا هەر لە هاوینی ساڵی ١٩٨٠ ئابلۆقەی چەکی لەسەر ئێران دانابوو- کەچی فەرەنسا لە ساڵانی ١٩٨٣-١٩٨٦ دەرگایەکی بچووکی کردەوە کە ئێران توانی (٥٠٠٠٠٠) پێنج سەد هەزار گوللە تۆپ لە کالیبەی (١٠٠-٢٠٣)ملم و

(١٢٠٠٠٠) سەدو بیست هەزار کەلوپەلی تەقەمەنی بەنرخی نزیکەی (٧٩٠) ملیۆن فرەنکی فەرەنسی بکرێ کە بەرامبەر (١٥٨) ملیۆن دۆلار بوو.

میتران کە سەرۆکی فەرەنسا بوو خۆی ئاگاداری ئەو بازرگانییە بوو و پارتی سۆشیال دیموکرات کە میترانیش سەر بەو پارتە بوو، نزیکەی (٢,٥ تا ٣) ملیۆن فرەنکی کرێ وەرگرت. لە ١٩٨٦/٢/٢٨ رۆژنامەنووس (داینل جوبێرت) لە رۆژنامەی (لا پرێسە دێ لامانشێ) بەلگەنامەیەکی بلاوکردەوە لەسەر بارکردنی چەك لە بەندەری کێربورگ لەناو بەشی بارکردنی کەشتی نیکۆلا، لەژێر ئالای باهاماس، کە بارەکەش بۆ ئێران دەچوو.

بە ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی هەلبژاردن لەم ولاتە دەستپێبکات، وەزیری بەرگری کە لە پارتی سۆشیال بوو و ناوی کیلی بوو، داوایەکی دژی بەرێوەبەری کارگەی لوکاری تۆمار کرد.

لەسەرەتای مانگی تشرینی دووەم ١٩٨٧ فیگارۆ کە سەر بەپارتی پارێزگاران بوو، نهێنی پشکنینی وەزارەتی بەرگری بلاوکردەوە و خستییەڕوو- پاشان حکومەتی فەرەنسا رێگایدا بە هەناردنی چەك بۆ ولاتانی: یۆگۆسلاڤیا، پورتوگال، پاکستان، ئەکوادۆر.

بەلای کەمی پورتوگال ئەو نارنجۆکانە دروستدەکات، ئەکوادۆریش کەموکوڕی هەیە لەم نارنجۆکانە بۆ تەقاندن.

لە راپۆرتەکەدا هاتووە کە بەشێك لەسەر ژمارکردنی سوپەرمارکێتی فەرەنسی لە سالانی ١٩٨٥-١٩٨٦ دەرکەوت کە ئەم جۆرە تەقەمەنییانە بەکارهاتبوون. کە نزیکەی بایی (١٠٠) ملیۆن فرەنکی فەرەنسی بوو کە بەرامبەر بوو بە نزیکەی (٢٠) ملیۆن دۆلار.

کە پێناو (وسیط)ی ئێرانی و ئیتالی لەم بازرگانییە وەریان گرتبوو، کارگەی لوکاری توانی قەبارەی ئالوگۆڕکردنی دوو ئەوەندەی تر گەورە بکات.

(جان فرانكو دوبۆز) كە لە ژووری پێشەوەی وەزیری بەرگری سۆشیالیستی كە ناوی هێرنو بوو دائەنیشت. ئەم پیاوە (جان) كلیلی ئەم كردەوە ئابڕووبەرەبوو. هەر ئەوبوو پرسیاری لە جەنەرالی ئاسایش كرد كە ئەو چەكانە لە كوێ ماونەتەوە. تێبینی لەسەر دایێ: (ئایا جەنابت لیّم تێدەگا؟). لوكاری پارەی سندوقی پارتی سۆشیالیست دەخوات، بەڕێوەبەری كارگەی لوكاری (فالكۆز) ئەو قسانەی بەدرۆ لە قەڵەمدا، بەڵام فالكۆز لە هەمان كاتدا ئەمینداری سندوقی سۆشیالیست بوو لە پارتی (هیرنۆ).

میتران لە ١٩٨٤/٥/٢١ ئاگاداری ئەو بازرگانییەی چەكی بە ئەدمیرال (لاكۆستا) گوتبوو كە ئەو كات بەڕێوەبەری هێزی ئاسمان بوو، ئەمڕۆش قوربانی ئەم سكاندالەیە (فضیحة)یە كە سەرۆك میتران پێی گوتووە بنێرە لای هیرنۆ.

## ئیتاڵیا مینەكانی خۆی لادەبات

ئیتاڵیا ولاتێكە لەباری پیشەسازی چەكەوە تازە پێگەیشتووە بە بەراورد لەگەڵ ولاتانی دیكە.

لە (٣٠٠) سێ سەد كارگە (٨٥٠٠٠ تا ١٠٠٠٠٠) كرێكار كاردەكەن. بەرهەمی ساڵانەی (٩,٥) ملیار لیرەی ئیتاڵییە كە دەكاتە نزیكەی (٥٠) ملیۆن دۆلار. و چارەگێكی بەرهەمی ئەو پیشەسازییە بۆ دەرەوە دەنێرێ. تەنها لە ساڵانی ١٩٨٥- ١٩٨٦ لە ٤٠٪ بەرزبووەتەوە، لە لیستی جیهانی ئیتاڵیا شەشەم ولاتە لە هەناردنی چەك.

(CNR) كانیری ناڤالی روینیتنی كە كارگەیەكە سەر بە سەرمایەدارەكانی ولاتی ئیتاڵیایە، لە ساڵی ١٩٨٠ داواكارییەكی لەلایەن عیراقەوە پێدەگات كە چوار كەشتی گەورە و هەندێك كەشتی جەنگیی بە نرخی (١,٦) یەك ملیارو شەش سەد هەزار دۆلار بۆی دروستبكەن، ئەو كەشتییانە لەوپەڕی چەكدارییی پێشكەوتوو بێ، بەڵام

هێشتا ڕەوانە نەکراون. هەناردنی چەکی ئیتالی بۆ دەرەوە لە ساڵی ١٩٤١ لەژێری نهێنی سەربازییەوەیە.

هەناردنی چەك بۆ دەرەوە پەیوەندی بەلیژنەیەك هەیە کە پێکهاتووە لە نوێنەری پەیوەندییەکانی دەرەوە و بەرگری لە بازرگانی دەرەوە و نهێنی پیشەسازی- لەو ڕۆژەی کە گەیشتە دەستیان، پێویستە ئەو وڵاتە لە ماوەی شەست ڕۆژ ڕەزامەندی لەسەر هەناردنی دەربکات.

بەرامبەر چەند وڵاتێکی وەك لیبیا و سوریا قەدەغەیە چەکیان پێ بدرێ. و ڕێنوێنی سیاسی وایە کە نەنێردرێ بۆ سەرکردەکانی شەڕی کەنداو.

لە ساڵی ١٩٨٦ دوای ئەوەی هەندێك سکاندال (کردەوەی ئابڕووبەر) ئاشکرا بوو بەشێك لەو هەناردنەی قەدەغەکرابوو لەسەری لاکەوت.

وێنەی ژمارە (٢٠)

لەسەرەتای مانگی ئۆکتۆبەر (تشرینی یەکەم) سێ ئەندازیاری ئیتاڵی کە لە عیراق لە وێستگەی کارەبا کاریان دەکرد، لەلایەن گەریلاکانی کوردەوە دەستگیرکران و لەگەڵ خۆیان بردیانن. داواکاری کوردەکان ئەوەبوو کە ئیتاڵیا دەبێ یارمەتییەکی مرۆڤانەی کورد بدات و دەستهەڵگرێ لە ناردنی چەك بۆ رژێمی عیراق.

سەرۆك وەزیرانی ئیتاڵیا داوای کرد کە راگەیاندن لەم بارەیەوە بێدەنگ بێت، ئەگەرچی کەشتییەکان هێشتا هەر لە ئیتاڵیا بوون و رەوانەی عیراق نەکرابوون، بەڵام دەزگای بەرهەمی گازی دەمار دەتوانین بڵێین رەوانەی عیراق دەکرێ.

لە هەمان کات لێبوردنی گشتی دەرچوو بۆ ئەو کەسانەی بەرپرسیارن لە ئەنجامدانی ئەو کارەو سزا نادرێن و بووردراون- لەلایەن سەدام-ەوە.

لەنێوان ساڵی ١٩٧٨ تا ١٩٨٣ ئیتاڵیا بەبڕی (٤١٠) ملیۆن دۆلار چەکی بۆ عیراق هەنارد (کە عیراق لە هەموو جیهان بەبڕی (١٧) ملیار دۆلار چەکی کڕیبوو. ئیتاڵیا چەك بۆ ئێرانیش دەنێرێ، ماوەیەکی زۆرە ئیتاڵیا دەرگای بۆ ئێران کردۆتەوە. لە شەشی ئەیلول دادگای ئیتاڵی (٤٦) فەرمانی دەستگیرکردن (أمر قبض)ی دەرکرد، دوای ئەوەی کەشتییەکی لوبنانی لە بەندەری باریی ئیتاڵیا دەستی بەسەر چەك و دەرمانی بێ هۆشکردن داگرت، لەو کاتەی هێزی دەریایی ئیتاڵیا نەیدەتوانی لە کەنداو ئەو هەموو مینانەی ناو رووبارەکان لاببات. چونکە ئەوەندە زۆری هەنارد بووە ئێران لە ساڵی رابردوو ٣٠٠٠٠ سی هەزار مینی زێی بەرێگای نێجیریا و سوریا گەیشتبووە ئێران.

کارگەی ڤاساڵی مێتال میکانیا لە شاری برێسکیا دوو ملیۆن مینی ئاویی ئامادەکردبوو بۆ ئێرانی بنێرێ. ئەو کارگەیەش سەر بە کارگەکانی بێرلۆتی و فیات بوو. بەڕێوەبەری کارگەکە ئەوەی بە پیلانێك دانا لەسەر ئەو وڵاتە، کە کڕیارەکان هەست بە دوژمنایەتی بکەن، مافیاش دەستی هەبوو لەم بازرگانییە، پێشتریش بەنهێنی و بەبێ ماندوو بوون چاوساغی بەکارهاتوویان لە خوارووی ئەفریقیا دەست دەکەوت.

بۆ ئەو پاڵ پێوەنان و نێوەندی و بەرتیلدانە دەبوایە ١٠٪ تا ٢٠٪ زیادە بخرێتە سەر نرخی چەکەکان.

ئەمڕۆ بە ڕێگای ئیسرائیل و سەنگافورە توانییان چەك بگەیەننە ئێران.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٦ پەرلەمانی ئیتاڵی گفتوگۆی لەسەر ئەم پاڵ پێوەنانەی چەك کرد. چەکی ئەمریکیش بەکەشتی دانیمارکی بەناو بەندەری تالامۆنیی ئیتاڵی بۆ تۆسکانا لەوێوەش بۆ ئێران دەچوو.

لە ٩/٢٤ گویسێپیێ لوپیس لەسەر سنووری سویسرا لەگەڵ پیاوێکی ئەندەنووسی بە (١٠) دە ملیۆن مارکی ئەڵمانی (کە دەکاتە نزیکەی (٧) حەوت ملیۆن دۆلار) گیران، دەنگۆ وابوو کە ئەو پارەیە بەشێکە بۆ پارەدانی چەکی ئەمریکی. لوپیس ئەوەی بە دژە وەستانێك لە قەڵەمدا و زانیاری زیاتریيدا لەسەر پاڵ پێوەنانی هەناردنی چەك.

## فۆست تەقە دژی فۆست دەکا[1]

لە نەمسا (١٨٥) کارگەی چەك هەیە لەگەڵ (٢٠٠٠٠) بیست هەزار کرێکار کە کاری تیادەکەن. قسەکەری وەزارەتی بەرگری ڕوونی کردەوە، ئەگەر وڵاتێکی بێلایەنی بچووك بڵێ بەڵێ بۆ سوپا، پێویستە ئەویش بڵێ بۆ بەرهەمی چەك.

ئەگەر ئەو بڵێ بەڵێ بۆ بەرهەمی چەك، پێویستە ئەویش بڵێ بەڵێ بۆ هەناردنی چەك. پێویستی خۆیان زۆر بچووکترە بەرامبەر ئەو تێچوونە گەورەو پەرەسەندووە.

بەڵام گۆڤاری (پرۆفیل)ی ڤیەنا باسی شتێکی تری کرد کە لە گۆڤاری (دێرشپیگلی) ئەڵمانی وەرگرتبوو: درەنگ گەیشتنی بازاڕی چەکی جیهانی گەورە کەوتە دەست دکتاتۆری ڤێزەون، کە لەگەڵ ئەوەش وڵاتە پیشاسازییەکان باشترە پیشانی نەدەن بەڵکو لەنێوەندایەتی بازرگانی خزمەتێکی تاڵیان پێشکەشکرد.

---

١- فۆست کارگەیەکی نەمساوییە چەك بە عیراق و ئێران دەفرۆشێ و هەردوولا بەم چەکە لەگەڵ یەکتر لە شەڕدان. (لەبەرئەوەی ئەدرەسی سەرەوە وایە).

کالاوس باربیی نازییکی تاوانبار بوو کە دەمێك بوو لە پۆلیڤیا خەریکی سیخوڕی بوو.

لە ساڵی ١٩٨٤ کارگەی نۆریکۆم کە لقێکە لە ئەلپینەی فۆست کە سەر بە دەولەتە گرێبەستێکی ئیمزاکرد لەسەر ئەوەی کە (٢٠٠) دووسەد کانۆن لەگەڵ ئەم گوللە تۆپانەی ماوەی (٤٠)کم دەڕوا پێویستە بەرەسمی ئەم کانۆنانە بگاتە لیبیا.

لە یەکەم زانیاری دەرکەوت ئەم کانۆنانە بۆ ئێرانن، کە باڵیۆزی نەمسا لە (ئەسینا) بروسکەیەکی لێدا کە ناوی (هێربێرت ئاوی) بوو بۆ نووسینگەی دەرەوەی ڤیەنا.

دوای حەفتەیەك لە ١٩٨٥/٧/١١ ئەو پیاوە مرد. دەرکەوت هۆی مردنەکەی خواردنەوەی (پەرداخێك کۆکتایل)ە، دڵی لەلێدان کەوت.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٦ گۆڤاری (شهرباستا) ئاشکرای کرد کە لە بەندەری یوگوسلاڤیا (٤٠) کانۆن دۆزرایەوە لەگەڵ مەرج و تایبەتمەندی ئێرانی.

ئەو کارگەیە ئەو ڕووداوەی بەدرۆخستەوە بەڵام حکوومەتی نەمساوی کاردانەوەیەکی تووڕەی پیشاندا و وەزیری ناوخۆ ئەو کارەی بە خیانەتێکی گەورە لە قەڵەمدا.

لە وڵاتێکی بێلایەنی وەك نەمسا کە هەناردنی چەکی بۆ هەردوولایەنی شەڕ قەدەغە کردبوو، ئەو بازرگانییە ڕاگیرا، پاش ئەوە (١٤٠) سەدو چل کانۆن گەیشتە ئێران، لە ناوەڕاستی مانگی تەمووزەوە پێنج کاربەدەستی ئەو کارگەیە کەوتنە زیندان. لە مانگی ئەیلول بەڕێوەبەری کارگەی (نۆریکۆم)یش گیرا. لەکاتی پشکنینی کارگەکە تەلگرافێك دۆزرایەوە کە لە ئێرانەوە هاتبوو و ئینزاریان کردبوون لە دواکەوتنی هەناردنی کەلوپەلی (ڕێکخەری تەلی گەرمی ئەلکترۆنی- تنظیم سلك حرائق الكتروني).

بازرگانی ئەوکانۆنە تاساڵی ١٩٨٨ بەردەوام دەبێ، کەدەبێ (٣٠٠) سێ سەد کانۆنی تر بەنرخی (٢,٣) دووملیارو سێ سەد هەزار مارك بۆیان بنێرن.

کانۆنی فۆست بەتەنها خزمەتی ئێران ناکات، بەڵکو لەوشەڕەی کەنداو فۆست دەفرۆشێتە عیراقیش، ئەردەن بەرەسمی داوای کردبوو.

## خەڵاتی نۆبل بۆئاشتی ـ چەك بۆشەر

بەڕێوەبەر (کارل بێرگ) لە پیشەسازی نۆبل لەو ماوەیە دانی بەوەدانا، کە دوو سەرمایەداری خاوەن کارگەی لقیی تووشی کێشە بووینە لە قاچاخچییەتی بە بازرگانی چەکی جەنگ. لە ساڵی ١٩٨٣ ئەو بازرگانییە دەستیپێکرد لە نێوان نۆبل دیامێنت و ئێران.

لقێکی کارگەی (بۆفۆرس- نۆبل) هەڵسا بە دروستکردنی کارگەیەکی تەقەمەنی لە بیابانی نێوان شیراز و ئەسفەهان. شارەزایانی تەکنیکی ئەمریکی بە پاسەپۆرتی ئەڵمانی بەشدارییان تیاکردبوو. هەناردنی چەکی جەنگ لەلایەن دەوڵەتی سوید بە باوەڕێکی تەواو قەدەغەکرابوو، بەڵام دەکرێ لە هەندێ حاڵەتی شاز ڕێگای پێ بدرێ.

لە ساڵی ١٩٨٤ تا ١٩٨٦ بە ڕێگای یوگوسلاڤیا (٢٠٠ یاخود زیاتر لە ٣٠٠ تەن لە مادەی (ناسفە) گەیشتە ئێران (٧٠) حەفتا ڕۆکێتی دژە ئاسمانی لەجیاتی ئەوەی بنێردرێتە سەنگافور گەیشتە بەحرێن و دوبەی، لەوانەشە کە تەقەمەنیش هەناردرابێ بۆ ئێران. و تێکڕای ئەو بازرگانییە بڕی (٢٠٠) دووسەد ملیۆن مارکی پێویستە کە دەکاتە ١٤٠ ملیۆن دۆلار.

ئەو داواکارییەش بە ڕێککەوتنێکی نهێنی لەگەڵ بەرهەمهێنی جیهانی جێبەجێ بکرێ، کە لەوانە: بەلجیکا، نەمسا، فینلاندا، هۆڵەندا، کارگەکانی خوارووی ئەفریقیا هەروەها کارگەی دیامێنت نۆبل لە ئەڵمانیا و کۆکردنەوەی لە کۆگای گشتی برێمن و هەناردنی بەرێگای بەندەری برێمن (برێمن شارێکی بەندەرە لە ئەڵمانیا) تا دەگاتە بەندەر عەباس لە ئێران، بەڵام بەڕەسمی دەبوایە بچێتە کینیا کە وڵاتێکی ئەفریقییە.

ڕێکخراوی ئاشتی سوید لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٨٤ داوایەکی دژی نۆبل تۆمار کردو وایکرد دەوربیینێ لە پشکنین، لەو ماوەیە حکوومەتی سویدی هەڵسا بە توندوتیژی و ڕێگرتن لە هەناردنی چەك و داوای لایەنگیری ئەو وڵاتەی کرد کە چەکی بۆ دەچێ. و ڕێگا نەدەن هەریەك لە خۆیەوە چەك بنێرێ و هەر وڵاتێك سەرپێچی بکاو چەك بنێرێ قەدەغە بکرێ و سزاش بدرێ.

کارگەی (بۆفۆرس)، (١٨) هەژدە لێکۆڵینەوەی لەسەربوو، یەکێك لەو لێکۆڵینەوانە ئەوەبوو کە داوایەکی کڕینی تۆپ (مدفع)ی لە هند وەرگرتبوو بە (٧٠) ملیۆن مارك و بەرتیلیشی بۆ تەرخان کرابوو.

کەشتی سویدی بچووك بوون و لە ئەلەمنیۆم دروستکرابوون بۆ رادار لە خێرایی پەنجا گرێکوێرە بوو تا بیگاتیێ، کە لە مانگی چوارەوە هێرش دەکەنە سەر تانکەرەکان، لەبەرئەوەی کەشتییەکان زۆرن رێگایاندا کە ئەو چل بەلەمەی دوایی کە لەلایەن کارگەکەوە داوا کراوە رەوانە بکەن.

## ١٠٠٠٠ دە هەزار دۆلار بۆ هەر کوژراوێك

چەندجار لە هەفتەیەك فڕۆکەکانی بارهەڵگری عیراقی جۆری 76 Jushin 11 لە تاریکی شەو لە قاهیرە دەنیشتن و سندوقی مردووەکانی تێدایە و دایاندەگرن و لە هەمان کات چەك باردەکەن. ئەو میسرییانەی لەشەڕ کوژراون هەریەك (١٠٠٠٠) دە هەزار دۆلار بەکەس و کاریان دەدرێ.

٢٥٠٠٠ تا ٣٠٠٠٠ بیست و پێنج تا سی هەزار شارەزایانی سەربازیی میسری لە عیراق بە ئارەزووی خۆیان لە عیراق خزمەت دەکەن.

نزیکەی ٤٠٠٠ تا ٤٥٠٠ چوار هەزار تا چوار هەزار و پێنج سەد میسری بەدیل گیراون و لە ئێرانن. بەقسەی وتەبێژێکی دەوڵەت ساڵانە نرخی چەکە نێراوەکانی میسر بۆ عیراق بایی ٥٠٠ پێنج سەد ملیۆن دۆلار دەبێ.

لەلایەکی تر رایدەگەیەنێ کە لەسەرەتای شەڕەوە نرخی چەکە نێرراوەکان بۆ عیراق گەیشتۆتە (٢,٥) دوو ملیارو پێنج سەد ملیۆن دۆلار.

هەروەها مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٨٣ زیاتر پاڵپشتی عیراقی کرد لە هەناردنی چەك، بەتایبەتی هەناردنی کەلوپەلی چەکی سۆڤیەتی، لەوساوە لە پێش هەموویان بەرهەمی خۆماڵی میسری، ئەوانەی کە بە هاوکاری فەرەنسا و ئینگلتەرا و برازیل دروستدەکرێن. وەك تۆپی هاوەن و پانچە و تەقەمەنی، بەڵام (٨٠) هەشتا فڕۆکە بۆ

مەشق پێکردنی فڕۆکەوانان کە برازیل ڕێگای پێدراوە بۆ عیراقی دروستبکات. تەنها بۆمبی ناپالم عیراق داوای دەکا بەڵام میسر ئەو داوایە ڕەت دەکاتەوە.

## ئیسپانیا سوود وەرگرە (مستفید)

کارگەکانی ئیسپانیا لە ساڵی ١٩٨٣ بایی (٢٨٠) دووسەدو هەشتا ملیۆن دۆلار چەکیان بۆ ئێران هەناردووە.

لە ساڵی ١٩٨٤-١٩٨٥ لە بەندەری بەرشەلۆنە (٩٢٠٠) نۆ هەزار و دووسەد تەن چەك بارکرابوو. لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٨٧ نزیکەی (٥٨٨٣) تەنی تربارکرابوو. ئەگەرچی حکومەتی ئیسپانیا ڕێگای هەناردنی چەکی پێ نەدابوون، بەڵام بازرگانانی چەك هەردەم دەیانتوانی کەلوپەلەکانیان لەژێر چاودێری پۆلیس باربکەن. هەروەها عیراقیش لەگەڵ ئیسپانیا ڕێکەوتنیان هەبووە.

قسەکەرێکی وەزارەتی دەرەوەی عیراق (احمد الگیلانی) ڕوونی کردەوە کە ئیسپانیا سوود وەرگرە لەو شەڕە، و پەیوەندی لەنێوان عیراق و ئیسپانیا نۆرماڵە، تەنها لەگەڵ چەك فرۆشەکانی کە بەرێگەی سوریا و لیبیا چەك بۆ ئێران دەنێرن.

ئەمریکاش لەلایەکەوە ئیسپانیا بەکاردەهێنێ بۆ بازرگانی چەکی خۆی و داوای بەرەلاکردنی ئەو دوو دیبلۆماتە دەکا کە ناویان (کابیلە و ئۆلیڤرایە) ئەو دوو کەسە چەکێك (شیك)ی بانکیان لە باخەڵدا گیرابوو کەهی بازرگانی ئێران بوو.

لەلایەکی تریش ئەمریکا دژی بازرگانیکردنی ئیسپانیایە لەگەڵ ئێران و ناڕەزایی دەردەبڕێ. بەڵام پێویستە ئەڵمانیا و بەلجیکا و پورتوگالیش چەك بۆ ئێران نەنێرن لەبەرئەوەی چەند سکاندالێك (کردەوەی ئابڕووبەر) دەرکەوتووە لەو کەینو بەینەو کە شەڕ بووە بە بازرگانی.

وێنەی ژمارە(٢١)

شەڕی کەنداو- ئەو چەکانە لە کوێوە دێت

لە ساڵی ١٩٨٠ هەتا ساڵی ١٩٨٦ هەردوو وڵاتی دوژمن بۆ بەرگری لە خۆیان چەك و تەقەمەنی راستەوخۆ و ناراستەوخۆ بە ئاشکراو بە قاچاغ لە ٤٢ وڵات وەردەگرن.

| ١٤ وڵات چەك بۆ ئێران دەنێرن | ٤ وڵات چەك بۆ عیراق دەنێرن |
|---|---|
| جزائر | میسر |
| ئیسرائیل | ئەسیوبیا |
| کەنەدا | ئەردەن |
| لیبیا | فلیپین |
| سوریا | |
| ڤێتنام | |
| و..... تد | |

ئەو وڵاتانەی چەك بۆ هەردوولا دەنێرن (عیراق و ئێران) بیست و شەش وڵاتن: چین، ئەڵمانیا، ئەڵمانیای دیموکرات، فەرەنسا، ئینگلتەرا، ئیتالیا، نەمسا، پۆڵۆنیا، سوید، سویسرا، ئەمریکا، سۆڤیەت.

## شەڕی گازی ژەهراوی
## لە جەنگی جیهانی یەکەم

لە ئەنجامی راستەوخۆ لەلایەن شارەزایانی سەربازی و زانایانی پیشەسازی و لێکۆڵینەوەی زانایان بۆ یەکەم جار زۆر بە بێدەنگی دەرکەوت کە لە ١٩١٥/٤/٢٢ لە سەعات ٦ی ئێوارە لەبەرەی رۆژئاوا لەناوچەی یوپرن گازی ژەهراوی بەکارهێنرا بۆ ئەوەی بەم جۆرە چەکە هێزی دوژمن بشکێنن.

سەربازی فەرەنسی چاودێری ئەوەیان دەکرد کە بۆ خۆپاراستن لە خەندەکەکان دوورکەونەوە، ئەو هەورە سەیرە وای کرد کە بۆ ماوەیەکی کەم ئەم تۆپە ئاگر هاوێژانە دژی دوژمن راوەستێ و خەڵك بەچاوی خۆی بینی، کە سەربازانی ئەو سوپایەی بە هەوادا فڕێدەدان و بینە قاقای گرتبوون و تەختی زەوی دەکردن و وەك کێوییەك دەیخنکاندن.

زۆربەیان هەڵنەسانەوە، لەو کاتە هاوڕێکانیان وەك لە خۆچووبن و سەریان لێ شێوا بێ بەرەو دواوە رایاندەکرد، وەك شێتیان بەسەرهاتبوو. بۆ رزگاربوون لەو تەمە بۆگەنییە هەڵاتن تا تەواوێك لە خەندەکەکان دوورکەوتنەوە.

نووسەر (کاتۆن دۆیلی) ئەم وەسفەی بەو وشانە کرد، لەسەر قسەی ئەو کەسانەی کە بەچاوی خۆیان ئەو رۆژەیان لە یوپرن دیبوو، کەبووە سەرەتایەك بۆ بەکارهێنانی گازی ژەهراوی لە مێژووی جەنگدا.

(فیلی فالێکس) ئەو ئەفسەرەی کە لە سەعات١٨,٢٠ خۆی ئاگاداری بە (مۆرداك)دا کە (٥)کم گەڕابۆوە پشت بەرەی جەنگ.

ئەو ئەفسەرە بە کۆخە و تەنگەنەفەسی یەکسەر لە گۆڕەپانی شەڕ لەبەرەی پێشەوە بە تەلەفۆن قسەی کرد و وتی: من زۆر بەهێز هێرشم دەکرێتە سەر، ئێستا دووکەڵێك وەك هەورێکی زەرد بڵاو دەبێتەوە، کە لە خەندەکەکانی ئەڵمانیاوە دێت بەرەو ئێرە و بەسەر بەرەکەمان بڵاودەبێتەوە، سەربازەکان دەستیان کردووەبە بەجێهێشتنی خەندەکەکان و بەرەو دواوە دەگەڕێنەوە، زۆریان کەوتن و خنکان.

(مۆرداك) ئەم هەواڵەی وا لە قەڵەمدا کە هاواری ئەفسەرێکە بۆ فریاکەوتنی کە وەك شێتی لێ هاتووە. پاش چەند دەقیقەیەك ئەفسەرێکی تر بەناوی (فابری) کە فەرماندەی بە تالیۆنی دوو بوو بەهەمان شێوە ئاگاداریدا، مۆرداك تێگەیشت کە ئیتر بووە بە جەهەننەم.

مۆرداك بەخۆی و بەچەند سەربازێك بەسواری وڵاغ چوونە بەرەی، لە نزیك کەناڵی یوپرن هەستیان بە تەپ بوونی گوێ و خورانی لووت و قوڕگیان کرد لەگەڵ تەنگەنەفەسییەکی زۆر. وڵاغەکانیش ملیان نەدەدا زیاتر بڕۆن، بە پێیان بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن، لە کەناڵەکە تووشی سەربازە هەڵاتووەکان بوون، کە چەکەکانیان فڕێ دابوو، هەموو دوگمەکانی بەرگی سەربازییان کردبۆوە وەك شێت ڕایان دەکرد- هاواریان دەکرد بۆ قومێك ئاو و تفی خوێناوییان فڕێ دەدا. بە گاگۆڵکە لەسەر ئەرز دەڕۆیشتن تا تۆزێك هەوا وەرگرن.

مۆرداك، هەموو کەناڵەکەی وەك کارەساتێك هاتە بەرچاو بێ ئەوەی لە گوللە و تۆپەکان ئاگاداربێ، لە هەردوولای کەناڵەکە تووشی کۆمەڵێك بوو کە وەك شێت خڕببوونەوە یەك، هاواریان دەکرد ئاویان بگاتێ بۆ ئەوەی ئازاریان تۆزێك کەم بێتەوە.

ئەو هەورە سەیرەو ئەو هیلاکییەی تووشیان ببوو بەهۆی ئەو (١٨٠) تەن گازی کلۆرە بوو کە بەسەریاندا کرابوو، کە شەش هەزار (٦٠٠٠) بوتڵی گازی کلۆر لەنێوان سەعات (٨) تا (٨,٥) هەشت و پێنج دەقیقە (واتا ماوەی پێنج دەقیقە) بەکارهاتبوو.

لەسەرەتای مانگی ئازار لە خەندەکەکانی پێشەوەی ئەڵمانەکان شاردرابۆوە.

بەهۆی هێرشی گازی ژەهراوی لەبەرە فەرەنسییەکان بۆشاییەکی شەش کیلۆمەتری وێران کردبوو، وای کردبوو هەموو تۆپە فەرەنسییەکان لەبەرەی شەڕ لەکار بکەون. کاتی خۆی فەرەنسا و ئەمریکا بڵاویان کردەوە کە (١٥٠٠٠) پانزدە هەزار کەس تووشبووی ژەهراویان هەیە لەگەڵ (٥٠٠٠) کوژراوی گازی ژەهراوی، بەڵام راستییەکەی ئەو ژمارەیە زیاد لە ژمارەی راستەقینە بوو.

بەڵام ئامۆژگای ئاشتی بۆ لێکۆڵینەوە لە ستۆکهۆڵم SIPRI لەساڵی ١٩٧٥ ئەم ژمارەیەی هێناخوارەوە و وتی تەنها (٧٠٠٠) بریندراری گاز و (٣٠٠٠) کوژراوی گاز هەبوو. لەو کاتەی کە مێژوونووسی کەنەدی (ئولریش ترومپنە) لەسەرچاوە سەرەکییەکەی فەرەنسی بە (٦٢٥) بریندراری گازی ژەهراوی لە نەخۆشخانەی سەربازی چارەسەرکران خەمڵاندبوو، تەنها سێ کەس لە مردن رزگاری بوو.

وێنەی ژمارە (٢٢)

دوای هێرشی گازی ژەهراوی

((سەربازە رووسەکانی تووشبوو بە گازی ژەهراوی لە گۆڕەپانی چارەسەرکردن))

## پێشبڕکێ لەسەر بەهێزترین چەکی کوشتن دەست پێدەکات

لە ئەیلولی ساڵی ١٩١٤ پرۆژەی شەڕی خێرای ئەڵمان شکستی هێنا، لەسەر ڕێنمایی کەسێتی پێشەوای هێزی ئاسمانی (ئێریش فان فالکن هاین) چەکی کیمیاوی بەکارهات. بۆ کەمکردنەوەی ڕووبەڕووی هێزی تەقینەوەی بەرامبەر تابگەنە خەندەکەکانی شەڕ. دکتۆری سەربازی (ماکس باوەر) لەسەر ڕێنمایی (فالکن هاین) گرووپێکی بچکۆلەی لە زانایان و پیشەسازان کۆکردەوە بۆ ئەوەی نارنجۆکی کیمیاوی پەرە پێ بدەن، بۆ وەدەرنانی سەربازانی دوژمن لە خەندەکەکان و جێگای خۆیان جێ بهێڵن.

لە مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ ئاگاداریدا بە پرۆفیسۆر (فرتیچ هابەر) کە بەڕێوەبەری ئامۆژگای پیشەسازی قەیسەر ولیەم بوو لە زانستی کیمیا و فیزیا و کیمیای ئەلکترۆنی و هەڵگری خەڵاتی نۆبڵ بوو لە زانستی کیمیا و راوێژکارێکی زانستی بوو لە پرۆژەی شەڕی گازی، کە سەربازەکان بە چ شێوەیەك گازی کلۆر لەکاتی شەڕ بەکاربێنن.

لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩١٥ فەرماندەی هێزی سەربازی لایەنگیری پێشنیاری هابەری کرد، و ڕێگایدا لە (٦٠٠٠) شەش هەزار بوتڵ کە لە پیشەسازی کیمیاوی هەبوو دەست بەسەر نیوەیدا بگرن.

لە ١٩١٥/١/٢٥ فالکن هاین بڕیاری دابوو پاش ئەو کۆنفراسەی کە لەگەڵ کۆماندۆی بەرەی ڕۆژئاوای کردبوو، کە پێویستە گازی ژەهراوی لە یوپرن بەکاربهێنرێ.

لەهەمان کات داوایان لە (هابەر) کردبوو کە ئەو زاناو راوێژکارانە لە سوپا کۆیکاتەوە لەو کەسانە کە لەدواییدا خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرت وەك: گوستاف هێرتیچ، ولیەم وێست فال، ئێرڤین مادەلونگ، ریشارد ویل شتێتە و هەردوو فیزیاوی ئەتۆم جێمس فرانك و ئۆتۆهان. دوای کۆبوونەوە و کارکردنی ئەو زاناو شارەزایانە چەکی کۆمەڵکوژی بە ئاشکراو بەرفراوان هەستی بەبوونی کرا لەناو هەموو نەتەوەکان.

یەکەم جار ئەڵمانەکان هەڵسان بە تێکەڵکردنی ٥٪ لە فۆسیجین لەگەڵ کلۆر کە هەردووکیان مادەی کیمیاوین.

لە ١٩١٥/٥/٣١ لە ناوچەی بۆلینۆڤ لەبەرەی رۆژئاوا هێرشێکیان کرد بە بەکارهێنانی (١٢٠٠٠) دوانزدە هەزار بوتڵ گازی ژەهراوی کە بووە هۆی خنکانی (١١٠١) هەزار و سەدو یەك سەربازی رووسی و (٨٩٣٤) سەربازیش تووشی گازی ژەهراوی بوون.

دکتۆر (هوگۆ شتۆلچن بێرگ) کە یاریدەری (هابەر) بوو باسی کاریگەری ئەم فۆسیجینەی کرد کە پێشتر لە شەڕی (یوپرن) تاقیکردنەوەی لەسەر کۆکردبۆوە و پاشان بوو بە حاڵەتێکی سکانداڵ (ئابڕووچوون) لە کارگەی کیمیاوی.

وێنەی ژمارە (٢٣)

**وێنەی هێزەکانی زەوی ئەمریکی لەکاتی هێرشکردن و لەوتاندنی ژینگە بەگازی ژەهراوی. ئەو هێرشە لە هاوینی ساڵی ١٩١٨ لەبەرەی رۆژئاوا بۆ سەرهێزی هاوپەیمانان، لەسەرەتای ئەیلولی ١٩١٨ سەرکردەکانی ئەڵمانیا بۆ جاری دووەم فەرمانیاندا نارنجۆکی گازی بەکاربهێنن. بەتایبەتی گازی کیمیاوی هەرە کوشندە بوو لە (لۆست).**

لەسەرەتای هەناسە وەرگرتن هەوای لەوتاو بەفۆسیجین هیچ کاریگەرییەك دیارنەبوو، بەڵام پاشان کە گەیشتە خوێن تووشی (سووتانەوەی هایدروکلوریك) دەبێ کە لەژێرەوە پەردەی سیپەلکەکان دەڕزێنیّ و خوێن لە سیپەلکەکان فڕێ دەدات و دوای خولەکێك دەیکوژێت.

دەرکەوت کە فۆسیجین کاریگەرترین چەکی کیمیاوییە، ئاوها ئەو پیاوە پەسنی بەرهەمی خۆی کرد کە هەتا ساڵانی حەفتاکان ئەم بەرهەمەی (چەکی کیمیاوی بۆ گازی دەمار) دروستدەکرد لە کارگەی هامبۆرگ.

هێزی سوپای ئینگلیز لە ئەیلولی ساڵی ١٩١٥ کۆر غازیان بەکارهێنا، فەرەنسییەکانیش لە مانگی شوباتی ١٩١٦ بەکاریان هێنا. رووسەکان لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٦ بەکاریان هێنا.

بە بەردەوامی چەکی کیمیاوی نویّ دادەهێنرا، فەرەنسییەکان هەڵسان بەتێکەڵکردنی بروسك ئەسید لەگەڵ کلۆریدی زەرنیخ، کە ئاراستەیان لە هاویشتن باشتربوو و بوتڵی گازی ژەهراوییان وەك نارنجۆك بەکاردەهێنا بۆ خەندەکی بەرامبەریان.

هێزەکانی ئینگلیز لە ساڵی ١٩١٧ شتێکی نوێیان بەکارهێنابوو دوای ئەوەی کە توانییان مینی گاز هاویشتن دروستبکەن و توانییان ئەو هاویشتنە لە (٥) پێنج کغم بوتڵی فڕیدان لەگەڵ ١,١ کغم لە چەکی کیمیاوی و دوایی (١١) کغم مینێکی گران لەگەڵ ٣,٢ چەکی کیمیاوی بەسەر ٣١٨ یاخود تا (٩١٠) مەتر بهاوێن.

سەرکردەیێکی سەربازی لە شەوی ٢٢ لەسەر ٢٣ی حوزەیرانی ١٩١٦ لە قەراخەکانی رۆژهەڵات لە فلویری هەڵسا بە دامەزراندنی (٧٦٠٠٠) حەفتاو شەش هەزار بەرگری خەندەك و (٤٠٠٠٠) چل هەزار نارنجۆکی تۆپی خەندەك کە وەك کەلەمی کەسك دیاربوو و پڕکرابۆوە بە چەکی کیمیاوی.

ئەو فەرەنسییانەی کە بە ٧ تا ٨ سەعات بەچاوی خۆیان دیتیان ئەو کاریگەرە گەورەی هێرشی نارنجۆکی ژەهراوی.

لەڕاستیدا ناتوانی بڵێی دەگریان بەڵام وەك دەنگی کەڵەشێر قووقەی بێ ئاوها هاواریان دەکرد. یاخود وەك (سعال الدیك) زۆر بەهێز و بێ وەستان بوو، ئەو کەسانەی کتوپڕ تووشی چەکی کیمیاوی بوون وەك کەوتبنە بنی دەریا وابوون، بەڵام هیچ چارەسەرییەك بۆ ئەوانە نەبوو. کەفێکی زەرد لەدەم و لێویان دەهاتەدەر، ناوە ناوەش دەمبینی کە بەهۆی گازەکە دەخنکان و دەمردن. هەموویان ئەو حاڵەتەیان هەبوو کە دەستیان شۆڕ دەبۆوە بۆخوار، ئەوە گوتەی ئەو سەربازە بوو کە هەزار مەتر لێیانەوە دووربوو.

ئەفسەرێکی پلە یەك (ملازم أول) گێڕایەوە کە ئەو هێرشەی گازی ژەهراوی شەش سەعاتی خایاند و گوتی ئێمە شەش سەعات بە بێدەنگی و مەلوولی خۆمان راگرت لەژێر ئەو ماسکە (قناع) و بە ترس و لەرزەوە پرسیارمان لە یەکتر دەکرد داخوا ئەو ماسکە دەتوانێ بۆ ماوەیەکی درێژ بمانپارێزێ.

ئەو بەدبەختانەی کەمتەرخەمییان کردبوو یاخود ماسکەکەیان باش نەبەستابوو لەژێر ئازارەوە مردن، من خۆم دەموچاوم دیتن کەلۆچاوی ببوو و کەفی سووریان لە دەم دەهاتەدەر و بەنینۆکی پەنجە سنگیان دەخوراند، کۆخەیەکی زۆر توند و بەئازاریان هەبوو، هاواریان دەکرد و خوێن لە لێویان دەهات.

(ئۆلاڤ گرۆلەر) لە کتێبەکەی خۆی باسی ئەنجامی ئەو مردنە بێ دەنگەی کردبوو کە لە بەیانی ١٩١٦/٦/٢٣ لە کاتژمێر شەش شەڕ راوەستابوو، ئەو ناوچەی نێوان (براس و فۆرت تاڤانە) و لەنێوان (سوفیلێ و فۆرتس فۆن فێردون) ئاژاوەیەك بوو باسی ناکرێ.

ئەو نارنجۆکە ژەهراوییەی کە لە کەلەمی کسك دەچوو، چی گیانلەبەر هەیە هەمووی لەناوبرد، گەڵای درەخت هەڵدەوەری، مشك و گیانەوەرەکان هەمووی کەوتبوون. ئەسپەکان کەفیان لەدەم دەهات لەسەر زەوی راکشابوون، بەدرێژایی رێگا تا دەگاتە سۆفیلێ.

لە دووەمین و گەورەترین کوشتاری چەکی ژەهراوی لە یوپرن لە رێکەوتی ١٢/ ١٣ مانگی تەمووزی ١٩١٧ مەترسیدارترین و کاریگەرترین چەکی کیمیاویان بەکارهێنا.

ئەم چەکە بەقسەی دوو زانای پسپۆڕ لە بواری زانستی کیمیا (ڤ. لۆمێل و ولیەم شتاین کۆپف) ئەم چەکە لەمەوپێش لە ساڵی ١٨٨٦ بەکیمیاوی ناسراوبوو و لە ساڵی ١٩١٦ ئاگادارییان لەسەر وەرگرتبوو.

ئەم کیمیاوییە لای ئەڵمانەکان ناوی (لۆست) بوو، لای فەرەنسییەکان ناوی (یوپرایت) بوو، لەلای ئینگلیز و ئەمریکییەکان لەبەرئەوەی بۆنێکی زۆر نامۆو سەیری لێ دەهات ناوی (زنیف گاز- گازی خەردەل) بوو. (موستارد) سەدو بیست و پێنج تەن (لۆست) بەکارهات.

ئەو چەکە کیمیاوییە نوێیە زۆر کوشندە بوو، چونکە نەرەنگی هەبوو نەبۆنیش، سەربازەکان نەیاندەتوانی پێی بزانن و خێراکاری خۆپاراستن بکەن، چونکە تەنها دوای ئەوەی هەناسەیان وەردەگرت یاخود پێستیان لێك خشابا ئینجا هەستیان بەبوونی ئەو گازە دەکرد.

ئەو گازە کە لەکاتی هەناسە وەرگرتنیان دەچووە بۆڕی هەناسەیان تا دەگاتە سیپەلکەکانیان دیواری بۆڕییەکە دەڕزایەوە و چاوەکانیشیان دەکزایەوە.

ئەو مادەی (لۆست) دوای دوو سێ تا چوار سەعات کاریگەری بەدەردەکەوت، وەك (ئەستووربوونی چاو، کۆخەی بەهێز، تالێهاتن، زگچون، خوران، پێست سووربوونەوە، بەتایبەتی پفکەی گەورە لەسەر دەست و باسك).

تا ١٩١٧/٧/١٦ (٢٢٢٩) سەربازی ئینگلیزی و (٣٤٨) سەربازی فەرەنسی بوونە قوربانی ژەهری لۆست و زۆربەیان لەنێوان دوو حەفتە تاچوار حەفتە دوای لێدانی ژەهرەکە مردن. لۆست جیاوازی هەیە لەگەڵ هەموو چەکە کیمیاوییەکانی پێشتر. کە لەگەڵ هەوا پەرش و بڵاو دەبێتەوە ناوچەکەی بۆگەن دەکرد و لەنێوان جل و بەرگی سەربازی و پۆستاڵەکان دەگەیشتە سەرپێست. بەڵام ئەو چەکە کیمیاوییە نوێیە یەك ساڵی دەخایاند و تەنها لە توانای سوپای قەیسەر بوو بۆ سەرپەرشتی.

یەکەم جار فەرەنسییەکان لە مانگی تەمموزی ساڵی ١٩١٨ نارنجۆکی یوپرایتیان بەکارهێنا، بەڵام ئینگلیزەکان لە مانگی ئەیلولی ١٩١٨ (گازی خەردەل- زئیف گاز)یان بەکارهێنا. پاش شیکردنەوەی (پرێنتیس) کە رائدێکی سوپایی ئەمریکی بوو لە ساڵی ١٩٣٧ دەرکەوت کە ئەو وڵاتانەی سەرکردایەتی شەڕیان دەکرد لە جەنگی یەکەمی جیهان (١٣٦٠٠٠) تەن چەکی کیمیاوییان بەرهەم هێنابوو. (١٢١٠٠) تەن بۆ ماوەی هەڵچوون کە کار لە مرۆڤ دەکات و (١١٢٠٠٠) تەن کە زیان بە سیپەلکەکان و بۆری هەناسەکێشان دەگەیەنێ.

(١٢١٠٠ تەن بەشی لۆست بوو لەناو دیواری چەکی کیمیاوی) و (١١٣٠٠٠) تەن لەکاتی شەڕ بەکارهاتووە، بەشی ئەڵمانیا نزیکەی (٥٢٠٠٠) تەن بوو، فەرەنسا ٢٦٠٠٠ تەن بوو، ئینگلتەرا (١٤٠٠٠) تەن بوو، نەمسا و هەنگاریا (٧٩٠٠) تەن بوو، ئیتالیا (٦٣٠٠) تەن بوو، روسیا (٤٧٠٠) تەن بوو، ئەمریکا نزیکەی (١٠٠٠) تەن بوو. ژمارەی قوربانییەکانی شەڕی گاز هێشتا نەچەسپاوە، ئەو کاتە (ئینلکو پادیە) بەریتانیا بە (٨٠٠٠٠٠) قوربانی بوو. گرۆلەر وتی یەك ملیۆن بوو و پرێنتیس وتی (١٢٩٧٠٠٠) قوربانیانی گاز بوون.

ژمارەی روسەکان بە تەواوی دیارنەبوو لەم دوو نێوانەبوو: لەلای پرێنتیسی ٤٧٥٠٠٠ بریندار گازو ٥٦٠٠٠ کوژراو بەگاز، بەڵام لای گرۆلەر ٢٥٠٠٠٠ بریندار و ٣٨٥٩٩ کوژراوی گاز بوو. فەرەنسا ١٩٠٠٠٠ بریندار و ٨٠٠٠ کوژراوی گاز. ئینگلتەرا ١٨١٠٣٥ بریندار و ٦١٠٩ کوژراوی گاز. نەمسا و هەنگاریا ١٠٠٠٠٠ بریندار و ٣٠٠٠ کوژراوی گاز. ئەڵمانیا ٧٨٦٦٣ بریندار و

٢٣٠٠ كوژراو. ئەمریکا ٧٤٧٧٩ بریندار و ١٤٠٠٠ کوژراو. دەرکەوت لە (١٠) ملیۆن کوژراوی شەڕ، کە زۆربەیان بە گازی ژەهراوی بوو بێ هیچ گومانێك زۆربەی هەرەزۆریان سەربازبوون.

بەڵام بەڕێژە کەمتر دیاربوو، لەبەرئەوەی پسپۆرانی گازی ژەهراوی لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی گەڕان بەدوای چەکی کیمیاوی نوێ کە بەهەزار هەندە ژەهراویتر بوو.

(فریتیچ هابەر) پاش کۆتایی شەڕ هێشتا هەر بەرگری دەکرد لە گازی ژەهراوی وەك ڕێگایەك بۆ هونەری جەنگی ستراتیجی، بۆ وانەگوتنەوەی لەسەر شەڕی کیمیاوی کە لە ١١/١١ بە فەرمی لە وەزارەتی بەرگری قسەی لەسەر کرد، ئەو کوشتارە کە بڕیاری شەڕی لەسەر دەرچووبوو نەك لەبەرئەوەی قەلاچۆی دوژمن بکات بە لەش (جسدیاً) بەڵکو لەباری دەروونی سەرکەوتووبێ، کە لەم حاڵەتە بڕیارێکی خێرا بدات بۆ وازهێنان لە هێزی بەرگری و بیروباوەڕی خۆی ئەو سەرکەوتنە بەجێ بێڵێ بۆ ئەوەی بەتەواوی کاریگەری دەروونی هەبێت بۆ لاوازبوونی بەرگریکردن. گوتەبێژی بازرگانی شەڕ وتی ئەمە گونجاوە بۆ جۆری گۆڕانی ڕێگاکانی شەڕی گاز بەڵام گونجاو نییە بۆ بەکارهێنانی نیشانەی هێزی تەقینەوە گەورەکان.

سوودی تەقینەوەی گاز لە شوێنی شەڕ بە مەبەستی بڵاوبوونەوە، لەبەرئەوەی ئەم گازە ژەهراوییە دەگاتە هەموو بەنداو و ئەشکەوتێك، ئەگەر بەراوردی بکەی بە تەقینەوەی نۆرماڵ کە پرووشکەکانی ناگاتە هەموو جێگایەك.

بەڵام دوای ئەوە کە ئەدۆلف هیتلەر هاتە سەرحوکم، ئەو پیاوە (فریتیچ هابەر) وەك جوولەکەیەك هەموو وەزیفە ئەکادیمییەکانی دۆڕاند و بۆ ئینگلتەرا ڕۆیشت و لەوێ کە دامەزرا وەك سەربازێك لە بەشی ئەندازە بۆ شەڕی گاز بەڵام زاناکان لەم کارە دووریان خستەوە، لە ساڵی ١٩٣٤ لە سویسرا کۆچی دوایی کرد.

وەك فریتیچ هابەر ئەوەی بەرگری لێ کرد (ئامۆس فریز) بوو لای پێشەوای هێزەکانی ئەمریکی کە بەرپرس بوو لە تیپی دۆزینەوە لە ئەوروپا. جەنەراڵ (پێرشینگ) هەموو ئەوانەی کە بەهیچ جۆرێك دەستبەرداری لێ نەدەکرا لەچەکی کیمیاوی لەلایەن سەرکردەکانی شەڕ.

ئەو چەکە گازییە واتایەکی مرۆڤایەتی دەدات بۆ سەرکەوتنی گەورە و ئاسایشی ئەمریکا، بەبیروڕای ئەو لە ساڵی ١٩١٨ ئەم هەموو سەرکەوتنە ڕێکوپێکانە لەگەڵ پێشەوای هێزەکانی جوولەکە بەرهەڵست بوو وەتوانی ١٢٠٠ ئەندازیاری تەکنیکی و ٧٠٠ سەرباز لە ڕاژەی سەربازی بەشی کیمیاوی دەربێنێ، ئەم پیاوەشی ڕزگار کرد لەگەڵ پشتیوانی پیشەسازی کیمیاوی لەکاتی ئاشتیدا.

## لەسەر ئەو قەدەغەکردنەش

## بە بەردەوامی و تەواوی کارکردن هەیە لەسەر چەکی کیمیاوی

سەرکردەکانی شەڕی کیمیاوی پێشتر لە ساڵی ١٩٠٧ لە شاری (هاگ- هۆڵەندا) رژێمی جەنگی بیابانیان قەدەغەکرد لە پارێزگاری یاسایی.

دوای تاقیکردنەوە تفت و تاڵەکەی جەنگی یەکەمی جیهانی، هەڵسان بە مەحکوومکردنی چەند رێکەوتنێکی یاسای نێو دەوڵەتی کە بەئاشکرا زێدەکرابوو، کە لە پەیماننامەی پاریس قەدەغەکرا بۆ دروستکردنی گازی ژەهراوی. پەیماننامەی جنێف لە ساڵی ١٩٢٥ لەسەر پرۆتۆکۆڵی گازی ژەهراوی کە بەکارهێنانی قەدەغەبکرێ.

جۆری ١٧١ لە پەیماننامەی فیرزایل لە ساڵی ١٩١٩ بڕیاری لەسەردرا، ئاگادار بکرێنەوە لە بەکارهێنانی گازی خنکێنەری ژەهراوی یاخود هەروەك گاز یان هەر جۆرێك لە شلەمەنی و مادانە کە کوشندەن تاقیکردنەوەیان قەدەغە بکرێت. بەتایبەتی لە ئەڵمانیا کە بەهیچ شێوەیەك رێگا بەدروستکردنی نەدرێت.

لەسەر ئەو ئەنجامانەی کە پارێزگاری یاسایی نێو دەوڵەتی قەدەغە دەکرد، بەرهەڵستییەك لەناو سوپا پەیدابوو دژی چەکی کیمیاوی گەڕان بەدوای لایەنگرە توندڕەوەکانی شەڕی گازی ژەهراوی جەنگی یەکەمی جیهانی، نەك ئەوانەی کە گازی ژەهراوییان لە کۆگا هەڵگرتبوو یاخود پەرەیان پێ دابوو لە فراوانکردنی بڵاوبوونەوەی. بەڵکو ئەوانەی کە هەوڵی قەدەغەنەکردنی ئەو بەرهەمە دەدەن گیروگرفتی بۆ دروست بکەن. لە ساڵی ١٩١٨ قوتابییەکانی (فریتیچ هابەر و ئامۆس فریس) زۆر بە بێدەنگی هەڵسان بە پشتگیریکردن لە پیشەسازی کیمیاوی کە بەبێ ماندووبوون دەتوانن ئامادەبن بۆ هێرشبردنی بەهێز و بەرگریکردن لە شەڕی گازی ژەهراوی.

دکتۆر (هوگۆ شتۆلچن بێرگ) لە ٢٦-٢٧، کانونی دووەمی ساڵی ١٩٢٣ لە دیمانەیەك لەگەڵ نمایندەکانی نووسینگەی چەکی سەربازی پێشنیاری کرد بۆ گەڕانەوەی بەرهەمی چەکی کیمیاوی، لە پێشەوە بۆ گەڕانەوەی ئەو چەکانەی لە (بێرلۆ) مابۆوە لە جەنگی یەکەمی جیهانی.

ئەم بێ ویژدانە نەك هەر زانیاری لەسەر سوپای رایخ هەبوو لە ئەڵمانیا بەڵکو لەسەر دەرەوەی وڵاتیشی هەبوو. بۆ نموونە بە ئیسپانیای گوت دەتوانن بە یارمەتی من ئەو راپەڕینەی (ریف کابیلن) بە چەکی کیمیاوی دامرکێنن. ئەگەر دەتانەوێ! کارگەکەی لە

هامبۆرگ هەموو رۆژ (١٦) تەن لەگازی ژەهراوی دروستدەکات و مانگانە (٦) شەش تەن لە جۆرێکی تر لە گازی ژەهراوی دروستدەکات. ئەگەر سوپای رایخ پارەو کەرەسەی خاوی بۆ ئەو کارگە دابین کردبا.

لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣ سوپای رایخ زۆر بە بێدەنگی و نهێنی لیژنەیەکی پێکهێنا بۆ پرسیاری (لێکۆڵینەوەی کیمیاوی) و لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٤ ئەم لیژنەیە پێشەوای هێزی ئاسمانی سوپای رانجی هەڵبژارد بۆ سەرپەرشتیکردن لە بەرهەمی چەکی ژەهراوی و بۆ بەرهەمهێنانی (فۆسیجین و کارگەی لۆست)- شتۆلچن بێرگ (٢٠) ملیۆن مارکی لە وەزارەتی سوپای رایخی ئەڵمانی تەرخان کرد بۆ ئەم مەبەستە.

بەڵام سوپای رایخ نەك هەر ویستی لەسەر پەرەسەندنی چەکی کیمیاوی هەبوو، بەڵکو ئەیویست لە دەرەوە کۆنترۆڵی ئەو وڵاتە سەرکەوتووانە تاقیبکاتەوە.

سۆڤیەت دەیتوانی لە دانوستان نهێنییەکانی هاوپەیمانی بەمەرجداری پێشکەش بە تەکنەلۆجیای چەکی کیمیاوی ئەڵمان بکات.

لە سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٢٣ سوپای رایخ داوای لە (شتۆلچن بێرگ) کرد کە سەفەرێك بۆ بکات، شتۆلچن بێرگ پێشنیازی کرد لە (ترۆك لەکن سەمارا لەژێرەوەی رووباری ڤۆلگا) جێگایەك بەیەکەوە تەرخان بکەن بۆ کارگەی بەرهەمی گازی ژەهراوی. کارگەیەکیان بە ناوی (روسیك، گیرمانیکا) لە ساڵی ١٩٢٥ خستەگەڕ، ئەم کارگە چەورەی سوپای رایخ لە بازرگانی چەك بە قاچاغ بۆ دەرەوەی وڵات. (وڵاتانی بێگانە). (١,٦٦٥) ملیۆن رۆبڵی زێڕی پێبڕا و سۆڤیەت (٥,٦٧) ملیۆن رۆبڵی زێڕی پێبڕا.

ئەو هاوکارییەی بواری گازی ژەهراوی لەنێوان سوپای رایخ و سوپای سوور لە ساڵانی داهاتووش بەهێزتر بوو. ئەم بەرهەمە لە ناوچەی رایخ جارێکی تر سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٢٨ لە (ئۆرانین بورگ) لە نزیك بەرلین بەرهەمی ئۆکسال (Oxal) و یەك لە بەرهەمەکانی پێشوو (Lost) لۆست.

لە هەڵبژاردنێکی یەك شەممە لە ١٩٢٨/٥/٢٠ هەواڵێکی کتوپڕی مەترسیدار بڵاوکرایەوە، کە گازی ژەهراوی بڵاوبۆوە بەسەر دانیشتوانی شاری هامبورگ، ئەوەش وای کرد کە خەڵکەکە ئارەزووی هەبێ لە ئەنجامی هەڵبژاردن.

لە کارگەی (موگن یورگ.G. m. b. H) لە بەندەری هامبۆرگ (فۆسیجین)ێکی داپۆشراو تەقییەوە و هەوری ئەو فۆسیجینە بەسەر گەڕەکی (گیۆرگ ڤێردە) لە شاری هامبۆرگ بڵاوبۆوە تا دەگاتە (ویلمس بورگ). ئەنجامی ئەو کارە سامناکە (١٠) قوربانی و (٣٠٠) بریندارى لێ کەوتەوە.

لە کاتی روونکردنەوە و لێکۆڵینەوە لە رووداوی گازی ژەهراوی دەرکەوت کە کارگەی (شتۆلچن بێرگ) نەك هەر لە بەندەری هامبۆرگ چەکی کیمیاوی جەنگی یەکەمی جیهانی لە کۆگا هەڵگرتووە، بەڵکو چەند ساڵێکە لەگەڵ سوپای رایخ بۆ بەرهەمی چەکی کیمیاوی پێکەوە کاردەکەن.

(کارل فۆن ئۆسیتچکی) کاتی خۆی هەستی بەوەکرد کە پێویستە جارێکی تر چاو بەسیاسەتی دەرەوە بخشێندرێ و چاودێری بکرێ، بۆئەوەی لە ئافاتی ئەو رادیکالانەی ناوەوە رزگاریان بێت و رێگەیان پێ نەدرێت بەهیچ جۆرێك، چونکە رووداني ئەو کارەساتە بەرێکەوت نەبووە، چونکە ئەو جێگایە سەردەمێکی درێژە بووەتە شوێنی قاچاغی چەکی جیهانی.

## نوێترین پەرەسەندن لە چەکی کیمیاوی دەمار

لە ١٩٣٦/١٢/٢٣ زانای پسپۆری کیمیاوی (دکتۆر گێهارد شرادە) خۆی بەرەنگەکان خەریك کرد (IG- Farben) کە لە ساڵی ١٩٣٤ بەدوای پارێزگاری لە رووەك دەگەڕا. بەرێگەی کاریگەری (توکسین) کە پێکهاتبوو لە ئاوێتەی ترشەڵۆکی فسفۆر، هەستی بە دۆزینەوەیەك کرد، هەڵسا بەرشاندنی گەڵادارێك بە مادەی کیمیاوی بە خەستی ١,٢٠٠,٠٠٠. هەموو زیندەوەرەکانی سەر ئەو گەڵادارە یەکسەر مردن. بەڵام لەدواییدا (شرادەر) و ئەوانەی کاریان لەگەڵ دەکرد تووشی بێ هێزبوونی چاو و تەنگەنەفەسی بوون، لە هەوڵدان دەرکەوت دوای چەند رۆژێك ئەو نیشانانەی لێیان دەرکەوتبوو چاك نەبوونەوە، پێویستیش بوو لەسەریان ئەم کارە بۆ سێ هەفتە رابگرن.

لە لەشی خۆیان کاریگەری ئەو مادە کیمیاوییە نوێیەیان دۆزییەوە، کە پاشان پێی دەوترا تابون (Tabun)- چەکی کیمیاوی دەمار. لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٣٧ سوپای رایخی ئەڵمانی یەکەم کیلۆی لەم رەنگە بێ بۆنەی چەکی کیمیاوی دەمار خستە ژێر دەستی خۆی کە کار لە ئەندامی هەناسەدان و پێست دەکات و لەماوەیەکی زۆر کەم ئەو کەسە دەکوژێ.

لە ١٩٣٧/٦/٩ لە کۆگای شاری میونستەر بە ئامادەیی ئەو کەسانەی کە پلانی گازی ژەهراوییان دادەڕشت لەگەڵ بەرپرسان و ئەفسەرانی سوپای رایخ تاقیکردنەوەیان لەسەر ئاژەڵان دەکرد بەتایبەتی بۆ ئەوەی بزانن ئەو مادە نوێیەی گازی دەمار تا چ رادەیەك کاریگەری هەیە.

لە راپۆرتێك دەرکەوت کە ئەم مادە ژەهراوییە نوێیە پاش چەند دەقیقەیەك دەمارەکان تووشی گرژبوون دەبێ، بەزۆری لە ماوەی (١٠) دە دەقیقە مرۆڤەکە دەکوژێ.

جاری واهەیە ئەم مادەیە کاریگەرییەکەی دەبێتەهۆی کوێر بوون لە بەیانی یاخود بەشەو و زۆر هەست بە ماندووبوون دەکات لە کاتی بەکارهێنانی بڕێکی کەم کە نزیکەی (٢٠٠) گرام بێ.

بۆ تاقیکردنەوە لەسەر ئەم گازە ژەهراوییە بەهێزە نوێیە لە (شپانداو) تاقیگەیەکیان کردەوە VIII L. پێش هەموو شتێك پەرەسەندن بەرێگای دورستکردنی، لە کۆگای (میونستر) لە کێلگەی تاقیکردنەوەکانی سوپا جێگایەکیان بۆ فڕۆکەوانەکان دروستکرد، کە مانگانە (٥٠) تەن (تابون) بگوزانەوە. کاربەدەستان (شرادەر) و یاریدەرانیان بردە کارگەیەکی نوێ کە ناوی (رەنگ IG)ە لە ئێلبرسفێلد. و لەوێ بە بێدەنگی و بێ ئەوەی کەس بێزاریان بکات و تابتوانن بە بەردەوامی تاقیکردنەوە لەسەر پێکهاتەی زیندوویێتی مادەی فسفۆر بکەن.

دوای سالێك شرادەر پێکهاتەیەکی تری کیمیاوی دۆزییەوە لە (تابون) کە (١٠) دە هەندەی تر کاریگەری زیاتر بوو لە مادە ژەهراوییەکانی تر.

لە پاش دەستپێکردنی پیتەکان چوارکەسی گرنگ بەشدارییان کردبوو لەم بەرهەمە: شرادەر، ئامبرۆس، (رەنگە IG)، ئۆربەرست رودیگە، ڤان دێرلیندە- کە شرادەر ناوی لەم چەکە کیمیاوییە نا (سارین- Sarin).

لە سالی ١٩٤٤ (دینارد کون) کە خەلاتی نۆبلی وەرگرتبوو لە کاتی پشکنینی زانستی لەسەر تابون و سارین لە پێکهاتەی زیندوویێتی فسفۆر ژەهرێکی بەهێزتری دۆزییەوە کە لەسارین ژەهراویترە.

لەو کاتەی کە تابون و سارین بە قەبارەیەکی گەورە و بەنهێنی چەکی کیمیاوی (تریلۆن ٨٣ و تریلۆن ٤٦) کە بەرهەمی کارگەی نوێی (رەنگ IG) بوو لە دێرنفۆرت و فالکن فۆست دروستدەکرا.

لە هاوینی سالی ١٩٤٥ (سۆمان) بۆ یەکەم جار هاتە بەرهەم. ئەگەرچی لە جەنگی دووەمی جیهانی بە قەبارەیەکی زۆر گەورە گازی ژەهراوی دروستدەکرا، بەلام بەکاریان نەهێنا، لەبەر ئەوەی هیتلەر باوەڕی وابوو کە هاوپەیمانانیش لەم جۆرە گازە ژەهراوییەیان هەیە.

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی بڕێکی زۆریان فڕێدایە ناو دەریا لە شوێنانی دیاری نەکراو و بە تێپەڕینی سەردەم لەبیر خرایەوە، بەلام جارجارە ماسییەکان لەناو دەریا نارنجۆکی ژەهراوییان سەرئاو دەخست. دوای چەند رووداوێکی جۆراوجۆر و بەزیرەکانە جارێکی تر ئەو چەکانەیان لە دەریاکان دەرهێناوە. هەندێ منداڵان لەکاتی یاریکردنیان شتی سەیریان دەدۆزییەوە.

کەس نازانێ ئەو هەموو چەکە کیمیاوییەی سوپای ئەڵمانی بۆ کوێ رەوانەکراو لە کوێ شاردراوەتەوە. کارتەکانی کۆگاو لەناوبردنی هەموو نووسین و پرۆتۆکۆل و گواستنەوە و هەموو دۆسیەکانی لەم بابەتە لە جێگای دوور و پارچە پارچەکراو دەبیندرێنەوە و ئەویش بەرێکەوت لە هەر جێگایەك ئەگەر تووشی بێ.

بیرورای جۆراوجۆر لەسەر قەبارەی چەکی کیمیاوی سوپای ئەڵمانی هەیە. پرۆفیسۆر (فرانچ. ڤ. زایدلە) کە لە قوتابخانەی سەربازگەی ئەکادیمی ئەڵمانیای یەکگرتوو وانەی سۆشیال و مێژووی سەربازی دەگوتەوە، لە ١٩٧٩/١٢/١٦ لە رۆژنامەی ئەڵمانیای خواروو کە باسی لەم گیروگرفتە کردبوو کە تائێستا گەڕان بەدوای پاشماوەی شەڕی کیمیاوی لە هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم و گەڕان و لەناوبردنی ئەم مادە ژەهراوییە هەتا کۆتایی ساڵەکانی حەفتا هەر بەردەوام بوو و دەبێ بەدەیەها ساڵی تریش بەدوایدا بەردەوام بن لە گەڕان. بەڵام ئەوانەی کەوتوونەتە ژێرەوەی دەریا ناتوانن بەهیچ جۆرێك دەری بهێنن لەبەرئەوەی کارەکە زۆر مەترسیدارە.

## گەڵای دار هەڵئەوەرێ

((دەرمانی کەوتنی گەڵای دار و چەکی کیمیاوی کە زیانی بۆ رووەك هەیە))

ئەو چەکە کیمیاوییەی کە پێش هەموو شت دژی مرۆڤ و ئاژەڵ رووبەڕوو دەبۆوە، لە ساڵی ١٩٤٥ ئەو کیمیا ژەهراوییە بووە دژی رووەکیش.

ئەمریکا بۆ یەکەم جار توانی لە یابان لە ناوچەی پاسیفیك ئەو مادە ژەهراوییە بۆ لەناوبردن و هەڵوەراندنی گەڵایدار بەکاربهێنێ. ئەو مادە کیمیاوییە دەتوانێ رێگانەدات بەهیچ جۆرێك رووەك بەهەموو جۆرێکییەوە شین ببێ یا هیچ نەبێ رێگای گەورەبوونی لێ دەگرێ. یان هەر بەتەواوی وشکی دەکات و دەیمرێنێ.

دەتوانرێ بۆ لەناوبردنی دەغڵ و دان و مەڕو مەڵات بەکاربهێنرێ، و زەوییەکە ئەوەندە بێ کەڵك دەکات هیچی لێ شین نابێ و دارستانەکانیش هەموو گەڵاکانیان هەڵدەوەرێ. دارو درەخت وەك سووتان هەڵدەکرووزێ یاخود نایەڵێ بەهیچ جۆرێك سەرهەڵێنێ. ئەو چەکە کیمیاوییە کە زیان بەدار و درەخت دەگەیەنێ. ئامانجێکی ستراتیجی هەیە لە بەکارهێنانی دژی دوژمن بۆ ئەوەی هیچ بەرهەمێك لە دانەوێڵە و شینایی وەدەست نەهێنێ. ئەو گەڵاو لقە دارانەی هەڵدەوەرێن دەکەونە خواروو ناتوانن وەك پووش و پەڵاش بەخۆیانی دادەن و خۆیانی لە پەنایدا بشارنەوە.

له پاش جەنگی جیهانی دووەم له ئەمریکا له ویلایەتی ماریلاند لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەم جۆرە کیمیاوییە کرد، لەناو سوپاش ئەم کیمیاوییەیان لەسەر دارودرەخت تاقیکردەوە. له مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٦١ تاقیکردنەوەیەکی گەورەیان لەژێر رێنمایی پرۆژەی (ئنگیلی) له خوارووی ڤێتنام کرد.

له ساڵی ١٩٦٢ له ناوچەی خوارووی ڤێتنام و ناوچەیەکی گەورە له کەمبۆدیا ئەو مادە ژەهراوییەیان بە هەندەی (٦٨,١٤) ملیۆن لیتر بەکارهێنا و رشاندیان، ئەو قەبارەیە (١٥٠) کیلۆ ژەهری (دیۆکسین)ی تێدابوو.

ئەو کیمیاوییە له بەشی ئەو مادە ژەهراوییە کە زیان بەدار و درەخت دەگەێنێ پێی دەوترێ (ئۆرانگە- Agent Orange).

له ساڵی ١٩٦١ بۆ یەکەم جار هەردوو مادە ژەهراوییەکە (پورپلە- بلوە) بەرێنمایی سەربازیی تاقیکردنەوەیان لەسەرکرا.

لەساڵی ١٩٦٥ پورپلەیان له جێگای ئەگێنت ئۆرانگە دانا.

ساڵی ١٩٦٦ (ئەگێنتی وایت)یان زیاد کردە سەر.

کاریگەری مادەی ئۆرانگە پێش هەموو شتێك ئەوەبوو کە گەڵاداری له دارستانەکان هەڵدەوەراند و پووش و پەڵاش و گەڵاکانی هەموو ڤێزەون دەکردن.

بەڵام مادەی (بلوە) زۆر بەخێرایی و لەماوەیەکی کەم گەڵاکانی هەڵدەوەراند و گژوگیای وشك دەکرد. هەروەها بۆ لەناوبردنی دەغڵ و دانوێڵە بەکاردەهات، له کاتێکدا مادەی وایت کاریگەرییەکی درێژخایەنی هەبوو لەسەر هەڵوەرینی گەڵای دار له دارستانەکان.

بەکارهێنانی ئەو مادە ژەهراوییەی دژی رووەك، له ڤێتنام و کەمبۆدیا بەکارهاتبوو. له ساڵی ١٩٧٤ شارەزاو پسپۆران و ئەکادیمییە ئەمریکییەکان بۆیان دەرکەوت کە کاریگەری ئەو مادە ژەهراوییە له ١٠ ساڵ یاخود لەوانەیە تا ١٠٠ ساڵ بخایەنێ. ئینجا مەگەر ئەو رووەکانە بتوانن جارێکی تر لەو ناوچەیە سەرهەڵبێننەوە.

و کاریگەریشی لەسەر مرۆڤ هەیە منداڵان بەکەمئەندامی لەدایك دەبن، نەك هەر له ڤێتنام بەڵکو له ئەمریکاش منداڵی ئەو سەربازانەی له ڤێتنام له جەنگ بوون بە کەمئەندام لەدایك دەبوون، پێویستە ئەو سەربازانەی بەشداربوون لەم جەنگە لەژێر چاودێریدا بن.

## کاریگەری بەکارهێنانی چەکی کیمیاویی دەمار دژی شارەکان

لە هەواڵێکی شارەزاکانی رێکخراوی تەندروستی جیهانی لەساڵی ۱۹۷۰ دەربارەی کاریگەری چەکی کیمیاوی و بایۆلۆگی، کە سەر بە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (un)ە. لە ساڵی ۱۹٦۹ لەسەر ئەگەری کاریگەری چەکی کیمیاویی دەمار دژی دانیشتوانی شارە گەورەکان لێکۆڵینەوەیان کرد. دوای لێکۆڵینەوەی رێکخراوەکە لە ساڵی ۱۹٦۹ دەرکەوت لە کاتی هێرشێکی کتوپڕ بە چەکی کیمیاویی دەمار بۆ سەر شارێك دانیشتوانەکەی (۸۰۰۰۰) هەشتا هەزار کەس بێت، (٤۰۰۰۰) چل هەزار کەس دەبێتە قوربانی، کەلەوانەش نیوەیان دەمرن.

لە ئەنجامی لێکدانەوەی شارەزایانی (WHO) لەسەر کاریگەری بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دەمار (VX) دژ بە شارێکی دانیشتوانی (٥) ملیۆن بێ لە وڵاتێکی پیشەسازی. ئەگەر لە شارێکی ئاوها (۱٥۰۰۰۰) سەدو پەنجا هەزار کەس بەر ئەو هێرشە بکەون بەلێدانی گازی (VX) یەکسەر (۸۰۰۰۰) هەشتا هەزاریان لێ دەمرێ. لەوانەیە (۳٥۰۰۰) سی و پێنج هەزار کەس رزگار ببێت بەهۆی گەیاندنی ئەو دوو جۆرە دەرمانە بەخێرایی کە بریتییە لە (ئەترۆپین و ئۆکسیم Atropin و Oxim) و (۳٥۰۰۰) سی و پێنج هەزارەکەی تر دەتوانرێ بەرێگای داو و دەرمانی تر چارەسەر بکرێن و رزگاریان بێت.

لێکدانەوەیەك لەلایەن دوو شارەزای چەکی کیمیاوی (مێسێلسۆن و رۆبینسۆن) کە بەشدارییان لەگەڵ شارەزایانی (WHO) کردبوو، لە ساڵی ۱۹۸۰ لە گۆڤارێکی ئەمریکی کە ناوی (سکێنتفیك ئەمریکان- Scientific America) ئەنجامێکیان دابوو کە، ئەگەر هاتوو بە شەش تەن (سارین) هێرش بکرێتە سەر باکووری ئەڵمانیا و دانیشتوانەکەی خۆیان ئامادەنەکردبوو لە خۆپاراستن، لەو جێگایە تا (۲۰)کم دووری مرۆڤ دەکوژێ. رووداوی شەڕی کیمیاوی لە ئەوروپا ئەگەر روویدا دەبێتە هۆی کوشتنی ملیۆنەها لە هاوڵاتییان. ئەم ئینزارە لە ناوەندی ئەورووپاش هەرای ناوەتەوە.

تێبینییەکی تر لەلایەن (رۆبینسۆن) لە شوباتی ساڵی ۱۹۸۲ کە لە کاتی شەڕی کیمیاوی لەناوچەیەك ئەگەر دانیشتوانەکەی زۆر بێت، بەرامبەر هەریەك سەرباز (۲۰) بیست هاوڵاتی دەبێتە قوربانی.

بەکارهێنانی ئەو چەکە ژەهراوییە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەم سەردەمە بەرێژەیەکی نزمتر دەبێت، هەروەها لە جێگایانی تریش هەر شوێنێ بەپێی چڕی دانیشتووان.

## هاواری یارمەتی ڕێکخراوی داکۆکی لە گەلانی هەڕەشە لێکراو

ئەو هێرشە کیمیاوییەی کرایە سەر ناوچەکانی کوردستان، پێش هەموو شتێك منالّ، منالّی ساواو پیرەمێرد و پیرەژن و ژنانی منالّدار تووشی ئەو کارەساتە بوون و هیچ شتێکی خۆپاراستنیان نەبوو و نەیاندەتوانی لە دەست ئەو گازە ژەهراوییە خۆیان دەرباز بکەن.

هەندێکیان توانییان لە یەکەم هێرشی ئەو گازە ژەهراوییە پەشتەمالّ- خاولی بە بەردەمیان وەك فلتەر بەکاربێنن، یاخود کیسەی پلاستیك لەسەری خۆیان هەلّکێشن، بۆ ئەوەی بتوانن بەسەر چیاکان بکەون. خەلّك ئاگریان هەلّدەکرد بۆ ئەوەی بەهۆی گەرمی گازە ژەهراوییەکە لەناو دولّەکان دوور خاتەوە. لە هەر جێگایەك ئاو هەبوایە هەندێك خۆیان فڕێ دەدا ناوی و لەپێش هەموویانیش گەنجەکان تا لەتوانایاندا بوو لەناو ئاوەکە دەمانەوە. بەلاّم هەموو کەس لەم کاتەی سالّ کە ساردبوو و بەفرکەوتبوو نەیاندەتوانی بەرێگای چوونە ناو ئاو خۆیان بپارێزن و بەرگەی ئەو ئاوە ساردەیان نەدەگرت.

لە بارودۆخی ئەو کارەساتەی کە هێرشێکی بەهێز بە چەکی گازی ژەهراوی کرایە سەر کوردەکان، لەڕاستیدا دەرکەوت تارادەیەك قوربانی زۆر نەبوو، لەبەرئەوەی کوردستان لە تۆپۆگرافی و ئاووهەوا ناوچەیەکی شاخاوییە و تاڕادەیەك دانیشتوانەکەی دەتوانێ بپارێزێ.

ئەو گوندانەی لەقەد چیاکانن و ئەو گازەش بەرەو خوارەوە دەنیشێ و چەند بەخێرایی خۆیان بگەیاندبایە بەرزایی و قەد شاخەکان ئەوەندە زیاتر دەیانتوانی خۆیان باشتر بپارێزن. بەلاّم ئەو هێرشە لەناوچە دەشتایی و زوورگەکان کە دانیشتوانەکەی دەرفەتی هەلاّتنیان نەبوو لە دەست ئەو هێرشە ژەهراوییە، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی ئاویان لەبیر دەردەهێنا هیچ چارەیەکیان نەبوو بۆ خۆ رزگارکردن لەم هێرشە کوشندەی دەکرایە سەریان. چونکە ئەو چەکە زۆر خێرا بلاّو دەبێتەوە.

کوردەکان دەیانەوێ تیمێکی مەشق پێکراوی تایبەتیان هەبێ بۆ ئەوەی دانیشتوانی ئەو ناوچانەی پێشبینی بۆردومانکردنی دەکرێ بە چەکی کیمیاوی، دانیشتوانەکەی وریا بکەنەوە و فێریان بکەن بە چ بەرگێك و بەچ رێگایەك بەرگری لە خۆیان بکەن.

ئەو تیمە چالاك نەبوون لە کاتی هێرشی ئەو چەکە ژەهراوییە و دوای هێرشەکەش کە بەشێك لە دانیشتوانی ناوچەکە بگوازنەوە یاخود چارەسەری پزیشکییان بۆ بکەن. و نەیانتوانی یارمەتی بریندارەکان بدەن لە کاتی گواستنەوەیان.

هەندێك لە هاوڕێیانی تۆكسین و زانیاران ئەو گفتوگۆیەی ئێمەیان بە داواكارییەكی سنووردار تێڕوانی و ئەم سنووردارکردنەیان بەجێ لە قەڵەمدا.

بەپێچەوانەوە بەرپرسانی كورد رایان وابوو كە ناتوانرێ بە بەردەوامی بەرگری لە دانیشتوان بكرێ، بەدابەشكردنی ماسك (قناع) و جلوبەرگی تایبەتی دژی ئەو ژەهرە یەكەم دەستكەوتیان ئاستەنگە و دووەمیش لەژێر بارودۆخێكی لەم جۆرەی كوردستان شتێكی بێ مانایە. ئەگەر چاوی لێ بپۆشین لە باری داراییەوەش سەرناگرێت.

پێویستە پرۆگرامی هەناردنی جل و بەرگی بەرگریكردن بۆ هاوڵاتیان دەست پێ بكرێ كە لەسەربازگەی ولاَتانی ئەوروپی شتێكی زۆر ئاساییە. ئەمەش بەلانی كەم لەكاتی هێرش بەگازی خەردەل دەتوانێ بەرگرییەك بێ. و بەچالاككردنی ئامرازی هەناسەدان بۆ منداڵان و ئامادەكردنی دەرمان دژی ژەهراوی بۆ ئەو بریندارانەی برینەكەیان قورسە بەرگری مسۆگەر دەبێ

پێویستە بریندارانی ئەو گازە ژەهراوییە بەخێرایی لە نەخۆشخانەكانی ئەڵمانیا وەربگیرێن و ماف و شكۆمەندییان بۆ بگەڕێننەوە لە خزمەتگوزاری. بەتایبەتی (٦٩) كەس كە برینەكانیان زۆر سەختە لە كوردستان چاوەڕوانن بە رێگای ولاَتێكی نێواندار بگەنە نەخۆشخانەكانی ئەڵمانیا.

لیزەپاسی نێو دەوڵەتییان بۆ ئامادەكردبوون كە پاش چارەسەركردنیان بەگەرەنتی بگەڕێنەوە ولاَتی نێواندار- كەلەناو لیزەپاسەكانیان نووسرابوو.

ئەم پرۆگرامە نیو ملیۆن ماركی ئەڵمانی تێ دەچوو و دەتوانرێ دووبارە بكرێتەوە.